# لێکۆڵینەوەی فیکریو سیاسی

- سنووری نێوان ( حکمة )و ( مداهنة )
- چەکی سامناکی تەکفـــــــیر
- جیـــاوازیی شــەرعی... تێگەیشــتن و مامەڵە
- رەشمــــاڵ لـــە ســـەردەمی شـــارە مەزنەکاندا
- عەلمانییەتی نامـۆ...
کاری ئایـــن لەســـەر دەولـــەت و کۆمەڵگە
- گـــەڕان بـــــەدوای هۆکـــانی دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردستانی لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ

فاضل قەرەداغی

١٤٢١ ی کۆچی ــ ٢٠٠٠ ی زاینی

## بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی

ئەم بابەتانەی كە لە دوو توێی ئەم كتێبەدا هەن لە چەند ژمارەیەكی‌گۆڤاری (رابەر)دا بڵاوكرابوونەوەو ویستم بە پەرش وبڵاوی نەمێننەوە و لە یەك كتێبدا كۆیان بكەمەوە. هەر لەو گۆڤارەشدا دوو یان سێ بابەتی كورتی تر هەبوون كە بە پێویستم نەزانی لە چاپ بدرێنەوە.

بابەتەكانی ئەم كتێبە هەمەجۆرن؛لە چۆنێتیی مامەڵەی ئیسلامی لەگەڵ عەلمانیەتدا بۆ تەكفیر بۆ جیاوازیی شەرعی تا دواكەتنی كوردستان ،بیروباوەڕی عەلمانی، مەسەلەی دەوڵەتی كوردی.وەك یارمەتییەكیش بۆخوێنەرئەمەی خوارەوە بابەتەكانە بە كورتی:

١- فیقهی كاری ئیسلامی... سنووری نێوان حیكمەت وموداهەنە : باسێكە لە بارەی حیكمەت لە رەفتارو كاری ئیسلامیدا وچۆن زۆر جار بە ناوی حكمەتەوە رووپاماییی بۆ كوفر دەكرێت.

٢-چەكی سامناكی تەكفیر: وڵاتانی موسڵمانان دیاردەی تەكفیریكوێرانەیان بۆ خۆیەوە دیوە بەڵام هەروەها تەكفیر فەرامۆش كراوە، هۆیەكی ئەمەش نەبوونی تەكفیری دروست و شەرعییە. تەكفیر پێویستە هەبێت بۆ جیاكردنەوەی هەق وناهەق و بۆ رێگە گرتن لە تەكفیری كوێرانە.

٣-جیاوازیی شەرعی... تێگەشتن و مامەڵە: موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا خیلافیان بۆ دروست دەبێت.ئیتر ئایا لە چ مەسەلەیكدا پێویستە خیلافیان نەبێت ولە چیدا رێگە بە خیلاف دراوە؟ لە خیلافی شەرعیدا چۆن رەفتار بكەین؟ چۆن رێگە لە تۆقاندنی فیكری بگیرێت؟

٤-رەشماڵ لە سەردەمی شارە مەزنەكاندا: دەبوایە بمانوتایە(رەشماڵی كورد).مەبەستیشمان ئەوەیە لە سەردەمی قەبەبوونی هێزی دەوڵەتەكان وگەورەبوونی شارستانیەت كورد خاوەنی رەشماڵە. كورد لە هەموو روویەكەوە دواكەوتووە.

٥-عەلمانیەتی نامۆ...كاری ئاین لەسەر دەوڵەت وكۆمەڵگە: هەوڵەكانی بەركەناركردنی ئاین سەركەوتوو نین.ئاین ئامادەیی بەردەوامی هەیە. عەلمانیەتیش نامۆیە لە رەوتی مرۆڤایەتیو تەنانەت لە ناو خودی خۆیدا نارێكە. باسەكە وەكو نموونە دەوری ئاین لەسەر پێشكەوتن (بە سلبی و ئیجابی)و لەسەر دەوڵەت دەهێنێتەوە.

٦-دەوڵەت لە كوردستاندا...گەڕان بە دوای هۆكانی دروست نەبوونی دەولەتی كوردستانی لە كۆنەوە تا ئەمرۆ: بۆچی لە كوردستاندا تەنها نموونەی (میدیا) وەكو دەوڵەت دەهێنرێتەوە؟ بەر لە میدیا دەوڵەتی تر لە كوردستاندا هەبوون بەڵام جگە لەو نموونە كەمانە نەبوونی دەوڵەتی یەكگرتووی كوردستانی سیمایەكی بەرچاوی كوردستانە. بابەتەكە باس لە هۆكانی ناوەوەو دەرەوە دەكات و تەركیز لەسەر ئەوانەی ناوەوە دەكات : هۆی جوگرافیوتۆپۆگرافی، دواكەوتن، پەرتەوازەیی،....

ئەمە كورتەی بابەتەكانە . گومان لەوەشدا نییە كە هەموو نووسەرێك پاش بڵاوبوونەوەی بابەتەكەی هەست بە هەندێك كەموكورتی دەكات وئەگەر هەر دەرفەتێكی بۆ بڕەخسێت دەستێكی پیادا دەهێنێتەوە. بابەتەكانی ئەم كتێبەش بە هەمان شێوە پێویستیان بە هەندێك دەستكاریوزیاد كردن هەبوو.لە هەموو حاڵەتێكیشدا هەموو باسەكان موناقەشەن هەڵدەگرن ئەویش وەكو هەر بەرهەمێكی تری مرۆڤ، نووسەری بەختەوەریش ئەوەیە كە رەخنەگری زیرەك وبە ئینسافی بۆ هەڵبكەوێت.

سلێمانی

١٤٢١یكۆچی –٢٠٠٠یزاینی

## فقهی كاری ئیسلامی

# سنووری نێوان (حكمه) و (مداهنه)*

كاری ئیسلامیی ئەمڕۆمان تووشی چەند كێشەیەك بووە كە چارەسەر نەكراون، ئەم چارەسەر نەكردنەش زیانی بەم كارە گەیاندووە.یەكێكیش لەو كێشانە تێكەڵ بوونی مەفهووم و بابەتەكان و نەزانینی سنووری هەر مەفهوومێك.

لێرەدا باسی تێكەڵبوونی دوومەفهوومی دانایی(حكمە) و رووپامایی(مداهنة) دەكەین.

ئەمڕۆ بەهۆی كەمیی علمی خۆمان وبەناوی حكمەتەوە چەندین حاڵەتی (مداهنة)مان لێ دەوەشێنەوە. موسڵمان دەزانێ موداهەنە دروست نییە بەڵام بە روونی نازانێت چ شتێك موداهەنەیە و چ شتێك ناچێتە خانەی موداهەنە.

كەمیی علیم و فیقه هۆیەكە بۆ ئەمە، هۆیەكی تریش ئەوەیە كە (ئارەزوو) هەروەها (بیرو باوەڕی شەخسی) دەست دەخەنە ناو بۆچوونەكان، بۆ نموونە ئەو كەسەی حەز بە نەرمی دەكات و سروشتێكی نەرمی هەیە لایەنی نەرمی بەسەر لایەنەكانی تردا زاڵ دەكات لەكاتی مامەڵەكردنی لەگەڵ خەڵكی دەوروبەریدا، ئەوكەسەش ئەگەر ئاگاداری خۆی نەبێ لە كۆتاییدا هەر دەگاتە حاڵەتی موداهەنە.

هۆیەكی تر بۆ ئەمە لاواز بوونی تەقواو لایەنی ڕوحیی مرۆڤ كە كاردەكاتە سەر وەرگرتنی هەق ئەگەر لەگەڵ بۆچوون وئارەزووەكانیدا نەگونجێ.ئەم لاوازییە روحییە مرۆڤ دووچاری حاڵەتی ترس لە خەڵكی دەكات وئەم ترسە رووەو موداهەنەی دەبات.

دێینە سەر باسی حیكمەت و دەڵێین : خوای گەورە لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرمووێ ﴿ادع الی سبیل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن.....﴾ ئایەتێكە دەتوانین بڵێین ئەوەندەی ﴿قل هو الله أحد﴾ لای بانگەوازكاران ناوبانگی هەیە.

حكمەت بە چەند واتایەك لێكدراوەتەوە وەكو (وضع الشيء في مكانه) واتەدانانی شت لە شوێنی شیاوی خۆیدا ،یان (سوننە) واتابەكارهێنانی سوننەت لە بانگەوازدا.

ئێمەش لێكدانەوەیەكی نزیك لە یەكەم هەڵدەبژێرین بەتایبەتی كاتێك ئایەتەكەی سەرەوە رەچاو بكەین ئەویش (بەكارهێنانی شێوازو ئیسلوبێكی گونجاو) . بەم پێیەش حكمەت ئەوەیە نەرمی لە شوێنی نەرمیدا بەكار بهێنرێ و توندو تیژی لەو شوێنەدا بە كار بێت كە توندو تیژی پێویست بكات، ئەمەش شتێكی تازە نییە .جگە لەمەش حكمەت بەكارهێنانی شێوازی قورئانییە وەكو : دەرخستنی ناڕێكی لە بیرو باوەڕە جاهیلییەكان ، ئەمە لەگەڵ چەند ئسلوبێكی تر كە ئێرە جێگەی باس كردنیان نییە.

ئەمە (واتە بەكارهێنانی قورئان هەروەها سوننەت) دەبێتە سنووری یەكەمی نێوان حكمەت و رووپامایی كە ئەوش بۆ خۆی سنورێكی زۆر فراوانە.

سنووری دووەم ئەوەیە كە حكمەت و شاردنەوەی ڕاستییەكان تێكەڵ بەیەك نەكرێن چونكە گرنگترین كاری بانگخوازان گەیاندنی پەیامەكەیە، ئەوەتا هەر سوورەتی (النحل) خۆی دەفەرموێت :﴿ولقد بعثنا في كل امة رسولا ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت﴾ (النحل :٣٦) ، واتە: بۆهەر ئومەتێك پێغەمبەرێكمان نارد كە (پێیان ڕابگەیەنێ) خودا بپەرستن و خۆتان دوور بخەنەوە لە تاغووت.. واتە : پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) ڕێی خواو ڕێی تاغووتیان بۆ خەڵك ڕوون كردۆتەوە. پێغەمبەران ڕاستییەكانیان لە خەڵك نەشاردۆتەوە چونكە خوای گەورە نەهیی لەو شاردنەوەیە كردووە : ﴿ان الذین یكتمون ما انزلنا من البینات و الهدی من بعد مابیناه للناس في الكتاب اولئك یلعنهم الله ویلعنهم اللاعنون﴾(البقرة:١٥٩) ، واتە: ئەو كەسانەی كە ئەو مەسەلە روونانە هەروەها هیدایەت دەشارنەوە پاش ئەوەی لە كتێبدا (كتێبی خودا) بۆ خەڵكیمان ڕوون كردنەوە ئەوانە خواش و لەعنەتكەرانیش لەعنەتیان لێ دەكەن.

جیگەی داخە بەڵكو جێگەی مەترسیشە كە هەندێك موسڵمان ڕاستییەكان دەشارنەوە یان پێچ و پەنا لە هەقدا دەكەن و رەنگ وبۆ لەو هەقەدا ناهێڵن ، بەهانەی ئەوانەش قسەی وەك ( نەوەكو فلان كەس یان حزب یان هەڵگرانی فلانە بیروباوەڕ ناڕەحەت بن و ئەمە ببێتە هۆی سڵكردنیان لە ئیسلام). هەڵبەتە ئەگەر سنووری یەكەمیان بەكار بهێنایە (كە لە سەرەوەدا باسمان كرد)

* گۆڤاری رابەر ژمارە (٣٠) ساڵی چوارەم١٤١٦-١٩٩٥ل١٣-١٥ بڵاوكراوەتەوە.

نەدەکەوتنە ئەم هەڵەیەو دەیانزانی کە حکمەت ئەوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستییەکانی بە زەقی و ئاشکرایی و بێ پێچ و پەنا دەخستە بەرچاوی موشریکەکان ، پێغەمبەر(ﷺ) تەنانەت لە هەڵەی موسڵمانانیش بێدەنگ نەدەبوو چونکە بێدەنگبوونی پێغەمبەر لە فیقهدا پێی دەوترێت (تەقریر) واتە پەسەند کردن ،لەبەر ئەوە بێدەنگبوونی ئیسلامییەکان لە چەوتییەکانی کۆمەڵ دەبێتە مۆری پەسەندکردن بۆیان. لێرەشدا دەڵێین : ئەگەر مەسەلەکە تەنها بێدەنگبوون نەبێ بەڵکو موداهەنەشی بچێتە پاڵ ئیتر دەبێت خەڵك چەندی تر سەریان لێ بشێوێ ؟بۆ نموونە ئەگەر موسڵمان نەك هەر چەوتیی فکرەی دیموکراسی ئاشکرا نەکات بەڵکو لەوەش زیاتر بڵێ کەوا فکرەیەکی باشە بۆ خەڵك.

ئەو کەسانەی کە بەکاری موداهەنە هەڵدەستن بەهانە بۆ خۆیان دەهێننەوەو ئەم کارە بە (مودارات)واتە نەرمی و موراعات ناو دەبەن ، لەوەش دەچێ بەڵگەی ئەوان ئەو فەرموودەیە بێ کە لە صەحیحی (بوخاری) دا چەند جارێك هاتووەو لە شوێنێکدا لە ژێر (باب)ێکدایە بە ناونیشانی (باب المداراة مع الناس) و لای موسلم لەژێر (باب)ی (مُداراة مَنْ يُتَّقى فُحشه)دا دانراوە :

*عن عائشةَ ان رجلاً استأذنَ على النبی (ﷺ) فقال أئذنوا له فَلَبِئْسَ ابنُ العشيرة او بئسَ رجلُ العشيرة فلما دخل عليه ألانَ له القولَ، قالت عائشةُ : فقلتُ : يا رسولَ الله قلتَ له الذي قلتَ ثمَّ النتَ له القولَ، قالَ : ياعائشة (وزادَ في روايةٍ متى: عَهَدتني فحاشاً) انَّ شرَّ الناسِ منزلةً عند الله يومَ القيامةِ من وَدَعَهُ أو تركه الناسُ إتِّقاءَ فُحْشِهِ (وفي روايةٍ : اتقاء شرِّه)* رواه البخاري ومسلم و ابو داود والترمذي واحمد.

واتە : پێغەمبەر(ﷺ) سەرەتا زەمی ئەو پیاوەی کرد پاشان کە هاتە ژوورەوە بە نەرمی قسەی لەگەڵدا کرد ئەمەش وای لە عائشە کرد داوای ڕوون کردنەوە بکات ئەویش فەرمووی : ئەو کەسەی ڕۆژی قیامەت خراپترین پایەی لای خودادا هەیە کەسێکە خەڵکی وازی لێ بهێنن تا خۆیان لە قسەی خراپی بپارێزن .

فوحش هەر شتێکە لە سنوور دەربچێ، لێرەشدا زیاتر مەبەست لە بەد زمانییە، ڕوونیشە کە (مداراة) لێرەدا خۆ پاراستنە لە کابرای زمان بەد.

(ابن حجر) لە (فتح الباري) دا دەڵێت :

(قرطبي) دەڵێ: *((لەم فەرموودەیەدا ڕێگە بە غیبەت کردنی ئەو کەسەی فیسق یان فوحشی ئاشکرا کردووە دراوە هەروەها غیبەت کردنی بکەرانی شتی لەم بابەتە وەك ستەمکاری لە حوکمداو بانگەشەکردن بۆ بیدعە ، ئەمەش لەگەڵ ڕێگەدان بە نەرمی جووڵان لەگەڵیاندا (واتا: مودارات کردنیان) بۆ خۆپاراستن لە خراپەکارییەکانیان بە مەرجێك ئەمە مرۆڤ نەگەیەنێتە موداهەنە لە دینی خوادا. پاشان قورطوبی هەر وەك (القاضي عياض) دەڵێ : جیاوازیش لە نێوان (مودارات) و (موداهەنە) ئەوەیە کە (مودارات) بەخشینی شتی دنیایە (بذلُ الدنيا) بۆ چاکەی دنیا (صلاح الدنيا) یان بۆ چاکەی دین یان بۆ چاکەی هەردووکیان لە کاتێکدا موداهەنە وازهێنانە لە دین بۆ چاکەی دنیا...پێغەمبەریش (ﷺ) نەرمی و ڕەفتاری چاکەی بەخشی لە بەش خۆی لە دنیا بەڵام بە قسە مەدحی کابرای نەکرد بۆیە ئەو قسەیەی کە لە هەقی کابرا کردی نارێك نەبوو لەگەڵ ڕەفتاری نەرمی لەگەڵیدا چونکە ئەو قسەیەی کە لەبارەی کابرا وتبووی (واتە نواندنی نەرمی لەگەڵیدا) بە چاکی مامەڵە کردنە .))* بڕوانە (فتح الباري، بەرگی١٢-ل ٧٠).

هەروەها ئیبنو حەجەر دەڵێ:

(ابن بطال) دەڵێ کابرای چیرۆکەکەی سەرەوە(عويەينە کوڕی حيصنی فـەزاری) بوو کە گەورەی عەشیرەتەکەی بوو و کە بە گەلۆری گوێڕایەڵکراو (الاحمق المطاع) ناوبراو بوو، عیاض(پاش ئەویش قورطوبی و نەوەوی) کارەکەی پێغەمبەریان (ﷺ) بەوە تەفسیر کردووە کە ویستبووی (تألیف)ی بکات واتە دڵی ڕابکێشێ بۆ لای خۆی بۆ ئەوەی قەومەکەی موسڵمان بن (الفتح،ل٦٩).

ئەمڕۆ موسڵمان هەیە دەڵێن ئێمەش ئەم تەئلیفی دڵانە دەکەین بەڵام بۆ ئەوەی کارەکەیان نەبێتە خۆ خەڵەتاندن دەبێ لە خۆیان بپرسن ؟ ئایا کاری پێغەمبەر(ﷺ) هیچ شاردنەوەیەکی ڕاستیی ئایینی تێدا بوو ؟ ئایا کارەکەی هیچ سەر لێشێواندنی خەڵکی یان تێکەڵ کردنی ئیسلام و کوفری بە دوادا هات ؟

کەواتە سنوری سێیەم نێوان حکمەت و موداهەنە (نەبەخشینی دینە) واتە تەنازول نەکردنە لە دینە، موداهەنە بەخشینی دینی تێدایە بۆیە نەهیی لێکراوە، خودا دەفەرموێت ﴿فلا تطع المكذبين ،ودوا لو تدهن فيدهنون﴾(القلم:٨-٩)، واتە : بەقسەی ئەو کەسانە مەکە کە وەحدانیەتی خوداو هەبوونی قیامەت. . . بەدرۆ دەخەنەوە، ئەوان ئاواتەخوازن تۆ ڕووپامایيان بۆ بکەی تا ئەوانیش ڕووپامایيت بۆ بکەن.

سنووری چوارەمی حکمەت ئەو سنوورەیە کە دەبێت (توقیە) تیایدا کۆتایی پێ بێت، ئەمەش لە خوارەوەدا ڕوون دەکەینەوە :

رەنگە لە سەرەتادا موداهەنە لە سەر بناغەی (تقیة) شەرعیەتی خۆی وەرگرتبێت. خودا دەفەرموێت: ﴿الا من أكره وقلبه مطمئن بالايمان﴾(النحل:١٠٦)، بە پێی ئەم بەشە ئایەتە موسڵمان بۆی هەیە ووشەو کرداری کوفر بکات ئەویش ئەگەر ناچار کراو ترسا ئەشکەنجە بدرێ یان بکوژرێ بەڵام ئەمە بە مەرجی جێگیر بوونی ئیمان لە دڵیدا.

دەبێ ئەوەش بزانین کەوا (تقیە) لەسەر ئاستی تاکە کەسدایەو نابێ هەموو موسڵمانان بیکەن (بڕوانە : د. عبد الكريم زيدان، الوجيز في اصول الفقه.ص٥٣) و تەنانەت لە ئاستی تاکەکەسیشدا وا باشترە ( عەزیمە) وەربگیرێ نەك (روخصە) واتا چاکتر وایە توقیە نەکرێ (ل٢٥)، ئێمەش دەڵێین (توقیە) لەسەر ئاستی کۆمەڵە ئیسلامییەکان یان بانگخوازی دەرکەوتوو یان زانایانی ئیسلام کارەساتێکە بۆخۆی، پێغەمبەر(ﷺ)و هاوڕێیانی توقیەیان نەدەکرد بەڵکو تەنها زۆر کەم لەو هاوڕێیانە کردبوویان، کەواتە پێویستە کەسانێك هەبن ڕێی تاوانباران ئاشکرا بکەن (ولتستبين سبيلُ المجرمين) (الانعام ــ٥٥). ئەگەر زانایان و کۆمەڵە ئیسلامییەکانیش بەم ڕوونکردنەوەیە هەڵنەسن ئەو کاتە دەتوانین بڵێین خەڵکەکە پەیامەکەیان بەتەواوەتی پێ نەگەیشتووەو ئەرکی تەبلیغ بەجێ نەهێنراوە.

توقیە لە سنووری تاکەکەسدا دەوەستێ و لەوە زیاتر بڕ ناکات، ئەمەش سنووری پێنجەمی حیکمەتە، کاتێکیش توقیە درێژ بکرێتەوە بۆ ئاستی کۆمەڵە ئیسلامییەکان ئینجا دەبێتە موداهەنە یان شتێك لەم بابەتە.

رەنگە ئەم چەند سنوورەی دەست نیشانمان کردن کەم بن بەڵام گومان لەوەدا نییە کەوا کەمێکیان پەیڕەو دەکرێن .ئینجا بێینە سەر چەند نموونەیەکی حکمەت و موداهەنە، سەرەتاش دوو نموونەی حکمەت دەهێنینەوە.

١- بوخاری (باب)ێکی ناو ناوە *(باب من ترك بعض الاختيار مخالفة ان يقصر فهم بعض الناس عنه فيقعوا في أشد منه)* واتە (( لە بارەی ئەو کەسەی واز لەهەندێ (اختیار) بێنێ لە ترسی ئەوەی نەوەکو هەندێك خەڵك تێ نەگەن لەو کارەو تووشی کارێکی خراپتر بن))، ئەو بابەش بۆ فەرموودەیەکە کە تیایدا پێغەمبەر (ﷺ)بە عائشە دەفەرموێت :(ئەگەر قەومەکەت تازە موسڵمان نەبوونایە کەعبەم دەرووخاندو دوو دەرگام بۆ دەکرد...هتد، بڕوانە : البخاري ١- كتاب العلم ورواه مسلم باطول منه ٢- كتاب الحج).

دانایی لێرەدا ئەوەیە کە تازە موسڵمانەکانی مەککە بە دەستکاری کردنی کەعبە نارەحەت دەبوون ئەوەشە کە لە ئوصولدا پێی دەڵێن (درء المفاسد اولى من جلب المصالح). ئیبون حەجەر ڕەحمەتی خودای لێ بێ دەڵێ:

سوودێکی فەرموودەکە ئەوەیە واز بهێنرێ لە(ئینکاری مونکەر) لە ترسی تووش بوون بە شتێکی مونکەرتر ، هەروەها ئیمامی موسڵمانان خەڵك بەو شتانە بەڕێوە دەبات کە سوودیان هەیە بۆیان هەتا ئەگەر (مفضول) بن واتا( شت هەبێ لەوان چاکتر) مەگەر ئەو شتانە حەرام بن (فتح الباري ــ ل٢٠٣).

ئێمەش ئەم تێبینییەمان هەیە : ڕاستە پێغەمبەر(ﷺ) دەیویست کەعبە چاك بکاتەوە بەڵام چاك کردنەکە بۆ ئاسان کردنی چوونە ناو کەعبەیە چونکە لە فەرموودەیەکی تردا دەڵێ کەوا قورەیش دەرگاکانیان بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان ڕێگە بە خەڵك بدەن بۆ چوونە ناو کەعبە یان ڕێگەیان پێ نەدەن، فەرموودەکانیش باسی دەرگاکە لەگەڵ مەسەلەی دروست کردنەوەی کەعبە لەسەر بناغەکەی ئیبراهیم دەکەن. سەبارەت بە دەرگاکەش موسڵمانان پاش فەتحی مەککە بوونە فەرمانڕەوا بۆیە کەس ئیتر ناتوانێ کەس مەنع بکات لە چوونە ناو کەعبە کەواتە هەر لەو کاتەوە هۆی مونکەرەکە نەما. داخڵ نەکردنی بناغەکەی ئیبراهیمیش بۆ ناو بینای کەعبەدا لەوە ناچێ (والله اعلم) هیچ گوناهێکی تێدا بێ، بەم جۆرەش ئەو دوو شتەی پێغەمبەر (ﷺ) وازهێنان لە گۆڕینی مونکەر نەبوون ..خۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا هەموو بتەکانی کەعبەی شکاند ئەمەش کارێکی گەورەترە لە دروست کردنەوەی کەعبە، مەبەستیشمان لەم موناقەشەیەدا ئەوەیە کە (ابن حجر) ڕەحمەتی خوای لێ بێت واتایەکی بە فەرموودەکە دا کە هەڵیناگرێ ؛مەبەستمان قسەکەی کە دەڵێ: (وازهێنان لە ئینکاری مونکەر...(تاکو)... شتێکی مونکەر تر) بوخاریش لە ناو نیشانی بابەکەدا وای نەووتوە بەڵکو باسی (اختیار) کردووە، جا ئەگەر ئەمە بەڵگەی ئەو کەسانە بێت کە وازهێنان لە ئینکاری هەندێك مونکەر دەهێنن ئەوا بەبێ بەڵگە دەمێننەوە . بەم شێوەیەش حکمەت ئەوەیە کە موراعاتی کزیی ئیمانی خەڵك بکەی لە مەسەلەیەکدا کە مونکەری تێدا نەبێت، نەوەکو ئەوانەی دەڵێن : با ئەمە نەکەی چونکە کاتی نییە و با ئەوەی تر نەکەین کاتی نییە... تا ئەوەندە دەزانن هیچ ناکەن غەیری بێدەنگی بگرە موداهەنەش.

٢- لە غەزوەیەکدا شتێك ڕوو دەدات نێوان موهاجیرییەك و ئەنصارییەك و هەر یەکێکیان هاوار دەکات بۆ کۆمەڵەکەی :موهاجیرەکە هاوار دەکات ئەی موهاجیرەکان.. ئەنصارییەکەش هاوار دەکات ئەی ئەنصارییەکان، سەرکردەی نیفاقیش

(عەبدوڵڵا کوڕی ئوبەی کوری سەلوول) وتی : ئەگەر بگەڕێینەوە مەدینە ئەوەی بەدەسەڵاتە ئەوەی زەلیلە دەردەکات، عومەریش بە پێغەمبەری (ﷺ) وت : ئەو پیاوە پیسە نەکوژین ؟ ئەویش فەرمووی : وازی لێ بهێنە با خەڵك نەڵێن محمد هاوڕێکانی خۆی دەکوژێت (رواه البخاري ومسلم والترمذي وأحمد).

پێغەمبەر(ﷺ) نەیویست خەڵك ئەم قسەیە بکەن هەروەها قەومەکەی کوڕی سەلوول کە عەشیرەتی (خەزرەج) بوون دڵیان بە کوشتنی نارەحەت دەبوو(ئەمەش تەنها لەسەرەتادا ئەگینا پاش ماوەیەك کوڕی سەلوول بە تەواوەتی لەلایەن عەشیرەتەکەیەوە بێزرا). لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) وازی لە هەقی خۆی و موهاجیرەکان هێنا واتا کارەکەی حکمەت بوو، کەواتە هەر کاتێك کابرایەك لە سەر موسڵمانان حساب بکرێت و هەڵەیەك بکات دەکرێ سزا نەدرێ ئەگەر خەڵکی تووشی فتنە بن هەرچەندە دەکرێ سەرزەنشت بکرێ چونکە کوڕی سەلوول حاشای لە قسەکەی کردو وتی شتی وام نەوتووە بەڵام خودا ئایەتی لە بارەی قسەکەی ناردە خوارەوەو ئابڕووی برد.

**ئەمەش چەند نموونەیەکە لەسەر موداهەنە :**

١- *چوونە ناو پەرلەمانی عەلمانی* :ئەمە مەسەلەیەکە باسی زۆری لە بارەوە کراوە.دەربارەی حەرامێتی و حەڵاڵێتیی چوونە ناو پەرلەمانی عەلمانیش رای جۆراوجۆر هەن کە لە نێوان حەڵاڵ کردنی رەها تا حرام کردنی رەهاوەن .لێرەشداو ئەوەی پەیوەندیی بە باسەکەمانەوە هەیە ئەو پرسیارەیە کە ئایا ئەگەر چوونە ناو پەرلەمان حەڵاڵ بێت ئەم کارە دەچێتە خانەی حکمە یان موداهەنە؟

ئیسلامییەکان لەم مەسەلەیەدا دوو حاڵەتیان هەیە یەکەمیان پێش چوونە پەرلەمان، ئایا خاوەن هەڵوێستن بەرامبەر عەلمانیەت وکوفر ؟ ئایا لای هەموو کەسێك ئاشکرایە ئەوان رەفزی عەلمانیەت دەکەن وبە گومڕاییی دەزانن و هەوڵ دەدەن بۆ زاڵ بوون بەسەریدا ؟ ئایا ئایەتی ﴿ولتستبين سبيل المجرمين﴾یان هێناوەتە دی؟ حاڵەتی دووەمیش پاش چوونە ناو پەرلەمان، ئایا لەسەر ئەم ڕەوتە بەردەوام دەبن یان موداهەنە دەکەن؟

ئەو کۆمەڵەی پێش چوونە ناو پەرلەمان خاوەن هەڵوێست نەبێ بەتەما نەبین دوای چوونە ناویەوە موداهەنە نەکات.

حاڵەتێك لە سیرەدا هەیە لەو حاڵەتە دەچێت کە تیایدا موسڵمان لە پەرلەمانی عەلمانیدا بەشداری دەکات بێ ئەوەی موداهەنە بکات ئەویش نوێژکردنی پێغەمبەرە(ﷺ) بەرامبەر کەعبەی پڕ لە بت. چونکە پێغەمبەریش(ﷺ) هەقی تەواوی راگەیاندبوو کەس لە موشریکەکان نەیدەوت کە پێغەمبەر (ﷺ) بەم نوێژە بتە زۆرەکانی کەعبە پەسەند دەکات بەڵکو دەیانزانی ئەگەر دەسەڵاتی هەبووایە تێکی دەشکاندن.

بەهەرحاڵ بەشداری کردن وبەشداری نەکردن لە پەرلەمانی عەلمانیدا پەیوەندیی بە فەتواوە هەیە. گرنگیش لە فەتواکە رەچاو کردنی بەڵگە شەرعییەکانە نەك ملبادانی دەلیلەکان بۆ پەسەند کردنی رایەکیان،بەڵام ئەوە دەمێنێتەوە کە بەشداریکردن لەهەموو حاڵەتەکاندا مەترسییەکی گەورەیەو رێگەیەکی کورتە بۆ تەنازولی کوشندە.

٢- *بەشداری کردن لە موناسەبەکاندا* : (ابن تيميه) لە کتێبی (اقتضاء الصراط المستقيم) دا بە دوورو درێژی باسی بەشداری نەکردنی (اهل الكتاب) لە جەژنەکانیاندا دەکات. ئێمەش بە کورتی دەڵێین : ئەمە لە چوونە پەرلەمان خراپترە چونکە موسڵمان ناتوانێ لە موناسەبەکانی (أهل الكتاب) و عەلمانییەکاندا ووتار بدات و ناڕەزایی خۆی دەربڕێ (ئەی کەواتە بۆچی هاتووە ؟) ئەمەش بە پێچەوانەی پەرلەمان ، کەواتە ئەگەر موسڵمان پێشتر هەڵوێستی هەبووبێ یان نەیبووبێ هاتنی بۆ موناسەبەکە واتای پەسەند کردنی ئەو موناسەبەیەو ئەمەش موداهەنەیە، ئەم شتەش پیرۆزبایی لە موناسەبە حیزبییەکانیش دەگرێتەوە.

٣- *دەقیقەیەك وەستان بۆمردووان* : ئەم کارە موداهەنەیەو پەسەند کردن کوژراوەکانیانە و پەسەند کردنی ئەو فیکرەیەیە کە لە پێناویدا کوژراون.

٤- *بەکار هێنانی هەندێك لە زاراوەکانیان.*

٥- *دەستخۆش کردن لەو کارەیان کە پەیوەندیی بە عەقیدەوە هەبێ.*

٦- *پەسەند کردنی بیروباوەڕەکانیان* : بۆنموونە بڵێیت (سۆشیالیزم بەشی خۆی خزمەتی مرۆڤایەتیی کردووە). بێگومان شتی وا ڕاست نییە چونکە هەتا ئەگەر باری ژیانی خەڵکیشی چاك کردبێ(کە ئەمەشی نەکردووە)، ئەوا دەزانین کە بەرەو دۆزەخ دەیانبات، یان مەدح کردنی بیری نەتەوایەتی، یان قسەی وەك (ئێمە بڕوامان بە دیموکراسی هەیە...).

هەموو ئەمانەش ئەگەر حاڵەتی زۆرەملێکردنی عەلمانییان تێدا نەبێو ئایەتی (الا من اکره وقلبه مطمئن بالایمان) لە گۆڕێدا نەبێ.

موداهەنە دەردێکە ئەگەر کۆمەڵە ئیسلامییەکان تووشی بن تێکەڵبوون (خلط) لە مەسەلەکاندا لای خەڵك دروست دەبێ ،واتە تێکەڵبوونی ئیسلام و غەیری ئیسلام.

(سید قطب) پاش باسکردنی (موفاصەلە) ـ واتە جیا کردنەوەی ڕیزی موسڵمانان لە ڕیزی کوفرو نیفاق ـ بانگی بانگخوازان دەکات و دەڵێ ئەگەر کاری (موفاصەلە) نەبێ لێڵی و موداهەنەو تێکەڵبوون دەمێنن، پینە کردنی دەمێنێ، بانگەوازیش بۆ ئیسلام لە سەر ئەم بناغە عەیبدارو لاوازە ڕاناوەستێ بەڵکو تەنها لەسەر حەسم و ڕاشکاوی و ئازایەتی و ئاشکرایی دەوەستێ (في ظلال القرآن ـ ٨ تفسیر سورة الکافرون ،ل٥٩٠).

هەروەها لە تەفسیری ئایەتی ﴿.........ولتستبین سبیل المجرمین ﴾دا دەڵێ ناڕەحەتترین شت کە ئەم ئیسلامیانە دەیچێژن لێڵی و نائاشکرایی و تێکەڵبوونە کە لە لایەك واتای (لا الە الا الله) و واتای (ئیسلام)و لە لایەکی تر واتای جاهیلیەتیان گرتۆتەوە(في ظلال القرآن ـ٣، الانعام ل٢٤١).هەروەها دەڵی" کە پێویستە بانگەواز بۆ خوا بە ڕوونکردنەوەی ڕێگای باوەڕداران و ڕێگای تاوانباران دەست پێ بکات و پێویستە بانگخوازان بێ ووچان بن و لە وتنی وشەی هەقدا موداهەنەیان نەبێ (ل٢٤٢).

# چەکی سامناکی تەکفیر[★]

ئەم باسە بۆ ئەوە نییە بزانین چی کوفرەو چی کوفر نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بزانین کەوا تەکفیرکردنی کەسان و ڕێبازەکان چەکێکی سامناك و کاریگەرە کە دەبێ زاناو بانگخوازانی ئیسلام بۆ ئابڕوو بردن و ئاشکرا کردنی کوفر بەکاری بهێنن و بۆ ئەوەی چیتر کوفر بە ئاشکرا نەوێرێ سەر دەربکات و عەیب و عاری کوفری تێکەڵ کراو بە ئیسلام بۆخەڵك دەرکەوێت .

ترس لە کافربوون بە هۆی تەکفیرەوە(لەگەڵ ترس لە کافران هەروا) وای لە بانگخوازانی ئیسلام کردووە ئەم شمشێرە کول و ژەنگاوی بکەن، ئەنجامی بەکار نەهێنانیشی ئەوەیە کوفر لە وڵاتماندا سەر بەرزدەکاتەوەو ئەوانەی کوفرەکەیان بە چەند قسەو کردارێکی ئیسلامی داپۆشیوە لەسەر خەڵەتاندنی خەڵك بەردەوام بن، ئەنجامێکی تریش ماوە لە دواڕۆژدا ئەویش پەیدابوونی چەند دڵگەرمێکی کەم تەقوای نەشارەزا لە ئیسلام کە خەڵك بەکۆمەڵ کافر دەکەن، دوایی حاڵ دەگاتە ئەوەی ئیسلامییەکانیش بە کافر بزانن.

کافرەکان بۆیە لە تەکفیر دەترسن چونکە لە ناو خەڵکدا ئابڕوویان دەبات و تەکفیرەکە بۆ خەڵکی ڕوون دەکاتەوە کە ئەو بێباوەڕانە توانیویانە بەوە بیانخەڵەتێنن کە گوایە شتێکی ئاساییە ئەگەر شوێنیان بکەون و لەهەمان کاتدا موسڵمان بن. تەنانەت ئەوانەش کە کوفری خۆیان ئاشکرا کردووە لە تەکفیر دەترسن ، باشترین نموونەش کۆڕەکەی خوشکە (صەبریە)ی یەککگرتووە، کە یەکێك لەو کۆڕانە بوو کە (یەکێتی ژنانی کوردستان)ی سەر بە (یەکێتی) بۆ مەسەلەی یاساکانی (الاحوال الشخصیە) لەم هاوینەدا سازی دابوون.

لەو کۆڕەدا ئافرەتێکی کۆمۆنیست کە ئەندامی سەرکردایەتیی (حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عیراق)ە ڕازی نەبوو وەڵامی خوشکە (صەبریە) بداتەوە کە ئایا بڕوای هەبوونی خوا هەیە یان نەءو هەموو جارێك دەیوت : (ئەمە مەسەلەیەکی شەخسییە)تا لە کۆتاییدا وتی (تۆ دەتەوێ بڵێم کافرم بۆ ئەوەی ژنانی کوردستان گوێم لێ نەگرن).

بەم جۆرە تەکفیر چەکێکی کاریگەرە بۆ دوورخستنی خەڵك لە کوفرو کارێکی پێویستە ئەگەر(واجب) نەبێ چونکە پەیوەستە بە تەبلیغ (واتە گەیاندنی پەیامی خودا).گومانیش لەوەدا نییە کە ئاشکراکردنی کوفر بەشێکی سەرەکیی تەبلیغە.

بەڵام لەلایەکی ترەوە تەکفیر چەکێکی خەتەرە بۆ خودی موسڵمانان لەبەر ئەو فەرموودانەی باسی تەکفیرکردن بە ناهەق دەکەن ، ئەمەش بوو وای لە زانایانی کۆن کردبوو بە ووریایی یەوە خۆیان لە قەرەی تەکفیری کەسان و کۆمەڵەکان بدەن. ئەوەتا (حافظ ابن حجر) لە(فتح الباري)دا قسەی (قورطوبي) لە (المفهم)دا دەهێنێتەوە کە دەڵێ:(مەسەلەی تەکفیر خەتەرەو سەلامەتی بە هیچ شتێك ناگۆڕینەوە) فتح الباري ١٤.

زانایەکیش دەڵێ : داخڵ کردنی کافرێك بۆ ناو ئایینی ئیسلام (واتە بەموسڵمان زانینی کافرێك)و دەرکردنی موسڵمانێك لێی مەسەلەیەکی گەورەیە لە ئاییندا(هەمان سەرچاوە).هەروەها(ابن ابی العز الدمشقی) لە (شرح العقیدة الطحاویة)دا دەڵێ : مەسەلەی تەکفیرکردن و تەکفیرنەکردن مەسەلەیەکە (فتنە)و بەڵاو ناڕەحەتییەکی گەورەی دروست کردو جیابوونەوەی زۆری تیادا بەرپابوو (شرح العقیدة ...، ٢،ل٤٣٢).

فەرموودەکانیش باسی ئەو کەسە دەکەن کە کەسێك کافردەکات وئەگەرئەو کەسە وا نەبێت کوفرەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی.با لێرەشدا کەمێك لە تەك ئەو فەرموودانە بوەستین :

ئیمام (موسلیم)فەرموودەیەکی هێناوەتەوە کە ئەمە بەشێکێتی : *(من دعا رجلا بالکفر او قال عدو الله ولیس کذلك الا حار علیه)*صحیح مسلم / کتاب الایمان، واتە (هەر کەسێك بە پیاوێك بڵێ کافرە یاخود بڵێ دوژمنی خواوئەو کەسە وا نەبێ ئەم شتە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی). ئیمامی (نەوەوی)یش دەڵێ مەبەست ڕواڵەت (ظاهر)ی فەرموودەکە نییە(واتە مەبەست کوفری ڕاستەقینە نییە)و مەزهەبی ئەهلی هەق ئەوەیە کە موسڵمان بە ئەنجامدانی گوناهی وەك کوشتن و زینا کردن کافر نابێ(بێگومان ئەگەرئەم گوناهانە بە حەڵاڵ نەزانێ ئەگینا بە حەڵاڵ زانینیان کوفرە) هەروەها ئەگەر بە براکەی بڵێ کافر،واتە ئەگەر بەو گوناهانە کافر نەبێ بە تەکفیری هەڵەش کافر نابێ. سەبارەت بە قسەی(( ئەوا کوفرەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی)) ئیمامی نەوەوی چەند تەفسیرێك دەهێنێتەوە :

---

[★] گۆڤاری ڕابەر – ژمارە (٣١-٣٢) ساڵی چوارەم، ١٤١٦– ت١،ت٢ ١٩٩٥ ل٢٢-٢٤ بڵاوبۆتەوە.

١.ئەگەر کەسێك تەکفیری ناهەق بە حەڵاڵ بزانێ خۆی کافر دەبێت.

٢. تەفسیرێکی تر ئەوەیە گوناهەکە بریتییە لە سووکایەتی کردن بە براکەی . گوناهی تەکفیرکردنی براکەشی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی نەك کافربوونەکە.

٣. تەکفیر بە ناهەق کافری ناکات بەڵکو ترسی ئەوە هەیە بەکار هێنانی زۆری تەکفیر بەرەو کوفری بەرێ هەروەك چۆن زۆر گوناه کردن مرۆڤ بەرەو کوفر رادەکێشێ.

٤.تەفسیرێکی تریش ئەوەیە فەرموودەکە تایبەتە بە (خەوارج) بەڵام نەوەوی دەڵێ ئەوە بێ هێزە چونکە زۆربەی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە خەوارج بە کافر نازانرێن.

٥. تەفسیری پێنجەم ئەوەیە تەکفیرکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی وەك چۆن خۆی خۆی تەکفیر کردبێ (صحيح مسلم بشرح النووي- ١ ـ حديث ١١١-٦٠). (حافظ ابن حجر)یش دەڵێ لە هەمووی بەهێزتر ئەوەیە کە کافربوونەکە ئەو کەسە دەگرێتەوە کە شتی وا بە کەسێکی تربڵێ کە بە موسڵمان ناسراوە لەکاتێکدا گومانی کوفری نەبردووە لێی، بەم جۆرە واتای فەرموودەکە ئەوەیە تەکفیرەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی وەك چۆن خۆی خۆی کافر کردبێ (فتح الباري١٢ـ كتاب الادب ـ باب مايُنهى من السباب واللعن).

فەقیهی فەرموودەناسەکان ؛ئیمامی بوخاری ،یەکێك لە بابەکانی صەحیحەکەی بەمە ناوناوە : (باب مَنْ كفَرَ اخاهُ بغيرِ تأويلٍ فهو كما قال) صحيح البخاري ـ كتاب الادب، واتە: (بابێك لە بارەی ئەوەی ئەگەر کەسێك بەبێ تەئویل براکەی خۆی تەکفیر بکات ئەوا خۆی بەو جۆرەیە). بەم پێیەش بوخاری کافر نەبوون بە هۆی تەکفیرەوە دەبەستێتەوە بە تەئویل کە واتای (ئیجتهاد) یان (تەفسیر) دەگرێتەوە وەك لە بابەکەی تردا دەردەکەوێت: (باب مَنْ لم يرَ إكفار مَنْ قال ذلك مُتأوّلا)، ( كتاب الادب) واتە : بابێك دەربارەی ڕای ئەو زانایەی کە ئەو کەسانە بە کافر نازانن ئەگەر بە تەئویلێك یەکێکی تر تەکفیر بکەن.

بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەی (علی کوڕی ابو طالب)ە لە بارەی (حاطب کوڕی ابو بەلتەعە) کە نامەی بۆ خەڵکی مەککە ناردو تیایدا ئاگاداری کردنەوە کە موسڵمانان نیازی پەلاماردانی مەککەیان هەیە ،کاتێکیش ئەم شتە ئاشکرا بوو (عومەر کوڕی خەططاب) فەرمووی (حاطب) نیفاقی کرد ، پێغەمبەریش (ﷺ) بە عومەری نەفەرموو بەم قسەیەت کافر بوویت ، بەڵکو ئەوەندەی فەرموو : چوزانی بەڵکو خودا تەماشای ئەهلی بەدری کردبێ (ئەوانیش ئەو موسڵمانانەی لەشەڕی بەدردا بەشداریان کردبوو) و فەرموویێتی : چیتان دەوێ بیکەن چونکە لێتان خۆش بووم ( *لە صحیح البخاری ـ کتاب الادب دا زۆر بە کورتی و بێ سەنەد هاتووە و لە (کتاب التفسیر)دا لە سوورەتی (الممتحنة) بە کاملی و (مەوصولی) هێناویەتی)*. کەواتە عومەر بە تەفسیرو بۆچوونی خۆی کابرایەکی بە مونافق زانی لە کاتێکدا ئەو کابرایە پێشتر ڕەنگە خوا لە گوناهەکانی خۆش بووبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا عومەر بەم قسەیەی کافر نەبوو.

بوخاری هەروەها فەرموودەکەی (جابر کوڕی عبد الله)ی هێناوەتەوەو کە تیایدا باسی ئەوەی کردووە (موعاذ) پێشنوێژییەکی دوورودرێژی کردو کابرایەك نەیتوانی بەردەوام بێ‌و لە ریزەکە هاتە دەرەوەو بە تەنیا نوێژی کرد، (موعاذ)یش وتی کابرا مونافقە، کابراش ئەمەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە ئەویش بە موعاذی نەفەرموو بۆچی وات پێ ووت، بەڵکو تووڕەبوو و ئامۆژگاریی کرد هەر کاتێك ئیمام بوو نوێژەکانی درێژ نەکاتەوە.

بەم جۆرە هەر کەسێك قسەیەك یان کردارێکی کوفری لێ وەشایەوە بەڵام خۆی کافر نەبوو و موسڵمانێك کافری کرد ئەو موسڵمانە بەو تەکفیرە هەڵەیە کافر نابێت، تەنها ئەوەش دەمێنێتەوە کە کەسێك بەبێ هیچ بەڵگەیەك کەسێکی تر کافر بکات ؛ ئەو کاتە بەلای زۆرەوە کافر دەبێت و بەلای کەمەوە یەکێك لەو پێنج تەفسیرەی بەسەردا دەچەسپێ کە (نەوەوی) باسی کردوون.

کە ئەمەشمان زانی ئیتر هەقمانە کاری ئەو بانگخوازانەمان لا سەیر بێ کە خۆیان لە تەکفیر دەدزنەوەو لەوە دەچێ (ظاهر)ی فەرموودەکانی تەکفیر وەردەگرن و تەکفیری ناهەق بە کوفری گەورە بزانن لەکاتێکدا کاری زۆری تر بە کوفری گەورە نازانن، ئەوانیش ئەو کارانەی فەرموودەکان ناوی کوفریان لێ دەنێن.

نموونەش لەسەر ئەوە هەمان فەرموودەکەی موسلیمە کە ئەمە بەشێکی تریەتی *(ليس مِنْ رجلٍ ادَّعى لغيرِ ابيه وهو يعلمه الاّ كَفَر)*، واتە : ئەو کەسە کوفری کردووە کە باوکی ڕاستەقینەی خۆی بناسێت بەڵام پیاوێکی تر بە باوکی خۆی دابنێ (ئەم بەشەش هەروەها لای بوخاری هەیە). ئەم فەرموودەیەش بە دوو شت تەئویل کراوە : یەکەمیان بۆ کەسێکە ئەم کارە بەحەڵاڵ

بزانیٚ دووەمیشیان ئەوەیە ئەم کوفرە کوفری نیعمەت و ئیحسان و مافی خوداو مافی باوکێتی نەك ئەو کوفرەی لە ئیسلام دەریبکات. (شرح النووي ـــ كتاب الايمان).

هەر هەمان ئەو بانگخوازانەشن کە لەسەرەوەدا ئاماژەمان پیٚ دان ئەم باسکردنەی کوفر لەم فەرموودەیەو چەندین فەرموودەی تر بە کوفری بچووك دەزانن (لەمەشدا راست دەکەن چونکە ئەمە هەروەها رای زۆربەی زانایانە) و (ظاهر)ی فەرموودەکان وەرناگرن کە ناوی کوفر لەو کارە دەنێن بەلاّم کاتێك باس دێتە سەر فەرموودەی تەکفیر نارەوا ، واتە فەرموودەی *((هەر کەسێك بە پیاوێك بلّیٚ کافرە یاخود بلّیٚ دوژمنی خواو ئەو کەسە وا نەبیٚ ئەمە دەگەرێتەوە بۆ خۆی))* دەچن (ظاهر)ی فەرموودەکە وەردەگرن و ئەمە دەکەنە بەهانە بۆ تەکفیر نەکردنی هیچ کەسێك.

لەم بارەیەوە ئەو قسەیەی (حسن الهضيبي) رابەری دووەمی ئیخوان (رەحمەتی خوای لیٚ بێت)هەیەو کە لە ناو زۆر بانگخوازدا بلاّو بۆتەوەکەو دەلّێت :(نحن دعاة لا قضاة) واتە : ئێمە بانگخوازین نەك قازی (تا حوکمی کافر بوون لە سەر خەلّك دەر بکەین) . ئەمەش قسەیەکە بەلّگەی لەسەر نییەو و ئەگەر مەبەستیش لێی ئەوە بیٚ کە نەوتریٚ (فلاّنە کەسی دیاری کراوی زیندوو دەچێتە بەهەشت و فلاّنە تری زیندوو دەچێتە ئاگر) ئەوا قسەیەکی راستە ، بەلاّ م ئەگەر مەبەستی لێی حوکمی کوفر بەسەر کەسدا دەرناکەین ئەوا قسەکە رەتکردنەوەی ئایەتی ﴿قل یا ایها الکافرون..﴾ە. نەك تەنها ئەوەش بەلّکو رەتکردنەوەی ئایەت و فەرموودە و بەسەرهاتی یەکجار زۆری سیرەتە ئەمەش قسەیەکی (ئیرجائی)ە (★) خوا لە ئەویش و ئێمەش خۆش ببێت.

## تەکفیری ئەوسا و ئێستا

ئایا بەم جۆرە مەبەستمان ئەوەیە تەکفیری کوێرانەو بەراست و بەچەپ بکریٚ ؟ وەلاّمی دروست ئەوەیە ئەم جۆرە تەکفیرە دەردێکە و پێویستە خۆمانی لیٚ بپارێزین.

کاتی خۆشی (خەوارج و موعتەزیلە) تووشی ئەو دەردە ببوون، بواریش هەبوایە باسێکی دووردرێژی خەوارجمان دەکرد ، تا سەختیی ئەو دەردە بۆ خوێنەر دەربکەوتایە، بۆیە لێرەدا بە کورتی دەلّێین : لای خەوارج ئیمام(عوثمان)وئیمام (عـلی)خودایان لیٚ رازی بیٚبە کافر حساب کرابوون ، پاشان خوێن و مالّی ئەو کەسانەیان حەلاّل کرد کە لەسەر بیروباوەری ئەوان نەبن ، دوای ئەوە دەستیان وەشاندو شەریان بەرپاکرد، پاش (موعاویە)و کاتی (عبداللە کوری ئەلزوبەیر) کۆمەلّەکەی (نەجدە کوری عامر) ئەوەیان بۆ بیروباوەرەکانیان زیاد کرد کە ئەو کەسەی لەگەلّیاندا بەشداری شەر نەکات کافرە هەتا ئەگەر هەمان بیروباوەری ئەوانیشی هەبیٚ.

سەبارەت بە موعتەزیلەش (الرافعی) لە (أعجاز القران)دا باسی یەکێك لەوان دەکات کە تووشی شێتیی تەکفیر ببوو. سەرەتا خەلّکی شارەکەی خۆی تەکفیر کرد، پاشان خەلّکی ناوچەکە ئینجا خەلّکی هەموو زەوی و لە کۆتاییدا تەنها چەند شێتێکی وەکو خۆی لەگەلّیدا مانەوە. ئەم بەسەرهاتەش کە ئەوپەری تەکفیرە (أبو عبادە الانصاری) لە پێشەکیی کتێبی (مفهوم الحاکمیة فی فکر الشهید عزام)دادەیگێرێتەوەو لە هەمان کتێبدا باسی وەزعی ئەفغانستان دەکات، بە تایبەتی پاش چوونە ناو (کابول)ی پایتەخت کە چۆن لاوی زۆر سەریان لیٚ شێواو هەندێکیان بەشێك یان هەموو سەرکردەکانی ئەوێیان تەکفیر کرد لەبەر ئەوەی گوایە هێشتا(وەلاء و بەراء)و حاکمیە لە دلّ و مێشکیاندا نەچەسپیوەو لێی تیٚ نەگەیشتوون، هەندێکی تریشیان خەلّکێکی زۆریان تەکفیر کرد، بەلّکو بانگخوازانیشیان تەکفیر کرد، لەوەش زیاتر هەموو خەلّکی سەر رووی زەمین. ناوبراو هەروەها بەسەرهاتی (عبداللە عزام)دەگێرێتەوە کە کاتی خۆی لە میسردا برایەکی خۆشەویستی خۆی نوێژی لەدوادا نەکرد، کاتێکیش لێی پرسی برادەرەکەی وتی چونکە من تۆ تەکفیر دەکەم ئەویش لەبەر ئەوەی تۆ (حسن الهضيبي)تەکفیر ناکەی وەوضە یبی تەکفیر دەکەم چونکە فلاّنەکەس تەکفیری ناکات !

(دکتور یوسف القرضاوی)ش لە کتێبی (الصحوة الاسلامية بين الجحود و التطرف)باسی کۆمەلّەی (التكفير و الهجرة)ی میسر دەکات، ئەویش لە کتێبی عبدالرحمن أبو الخیر (ذكرياتي مع جماعة المسلمين - التكفير و الهجرة) وەریگرتووە.

---

(★) الارجاء : بیدعەیەکی کۆنە کە هەلّگرانی (المرجئة)یان پیٚ دەوتریٚ و یەکێك لە قسەکانی ئەوەیە مرۆڤ ئەگەر ئیمانی هەبیٚ بە هیچ گوناهێك کافر نابیٚ، ئیمانیش لای ئەوان بریتییە لە باوەرو قسە نەك کردار و کەس کافر ناکەن کە شایەتمان بدات کردارەکانیشی هەر چۆنێك بن، ئەمەش بچووکترین بیدعەیە لە ناوبیدعەکاندا، بەلاّم لەوە ناچیٚ ئەمرۆ بە بچووکی مابێتەوە چونکە ئەمرۆ کوفر لە جاران زیاتر بلاّوە بۆتەوەو زیاتر تێکەلّ بە ئیسلام کراوە...

ئەم کۆمەڵە هەموو کەسێك تەکفیر دەکەن کە گوناهێك بکات و لێی پەشیمان نەبێ و حاکمەکان تەکفیر دەکەن چونکە حوکم بە قورئان ناکەن وخەڵك کافر دەکەن لەبەر ئەوەی بەو حاکمانە ڕازین و زاناکان تەکفیر دەکەن کە حاکم و ژێردەستەکان تەکفیر ناکەن و تەکفیری هەر کەسێك دەکەن کە فیکرەی خۆیانی پێ دەڵێن و قبووڵی ناکات، هەروەها ئەوەش کە قبووڵی دەکات بەڵام ناچێتە کۆمەڵەکەیان هەروەها ئەوەی دەچێتە ناوی و دوایی وازی لێ دەهێنێت(کە بە مورتەدو و خوێن حەڵاڵی دەزانن)، هەموو کۆمەڵە ئیسلامییەکانیش کە بانگەوازەکەی ئەوانیان پێ بگات و خۆیان هەڵنەوەشێنن و بەیعەت بە ئیمامەکەیان نەدەن کافرن... هتد (لاپەڕە ٥٤ – ٥٥).

ئەمەش دەردی تەکفیرکردنی کوێرانەیە،بەڵام چارە چییە ؟ کەس تەکفیر نەکەین ؟ بێگومان ئەمە چارەسەر نییە، بەڵکو ئەمە سەرچاوەی (یان بەلای کەمەوە سەرچاوەیەکی)دەردەکەیە : تەکفیری کوێرانە ئەنجامی وازهێنانە لە تەکفیری شەرعی، لەبەر ئەوەش دەبێت بانگخوازانی ئیسلام وریا بن : واز هێنان لە تەکفیرکردن تەکفیری کوێرانەی بەدواوەیە، تەکفیر نەکردن هەر بیدعەی کۆنی ئیرجائە ؛ بزانە ئەو زانایەی کە قسەکەیمان هێنایەوە نەك هەر تەکفیرکردنی بە شتێکی بچووك نەزانیووە، بەڵکو هەروەها بە موسڵمان زانینیش ولە(شرح العقیدة الطحاویة)ش باسی تەکفیر کردن بە تەنها نەهاتووە، بەڵکو هەروەها تەکفیر نەکردنیش و (ابن ابی العز)دەڵێ : لەبەر ئەوە لای زۆر لە ئیمامەکان بە (موطلە قی) ناوترێ : ئێمە کەس تەکفیر ناکەین بەهۆی گوناهێکەوە (لاپەڕە – ٤٣٣)واتا : گوناھ هەیە غەیری شیرك کە مرۆڤ پێی کافر بێت و بەم جۆرە باسی کۆمەڵێك دەکات و دەڵێت : (کۆمەڵێك دەڵێن : کەس لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین و بەمە تەکفیر بە گشتی نەفی دەکەن لە کاتێکدا لە ناو ئەهلی قیبلەدا مونافیق هەن کە کەسانی وایان تێدا هەیە لەوانەیە هەرکاتێك بۆیان بکرێ بەشێك لە کوفرەکەیان دەربخەن ، خۆشیان وا پیشان دەدەن کە ووشەی شایەتمان دەڵێن).(لاپەڕە – ٤٣٣).

ئینجا تەماشای دەوروبەرەکەت بکە : ئەوانەی کە کەس کافر ناکەن و بزانە چەند کەسی وا هەیە، تەماشای موناڤیقەکانیش بکەو بزانە چەند جار لە تەلەفزیۆن و گۆڤار و ڕادیۆ و ڕۆژنامەکانیاندا قسەو کرداری کوفریان لێ دەوەشێتەوە.

بیدعەی تەکفیرنەکردنیش وەك وتمان بیدعەیەکی گەورەتری لێ پەیدا دەبێ، ئەویش تەکفیرکردنی کوێرانە، بەڵام ئەمە تاکە ئەنجام نییە بەڵکو هی تریش هەن وەکو :

١. چەند کەسێکی کافر بە ناهەق دەخرێنە ناو بازنەی ئیسلام.
٢. ئاسانیی خۆحەشاردانی کافرەکان لە پشت پەردەی ئیسلام.
٣. بەردەوام بوونی حاڵەتی تێکەڵبوونی ئیسلام و کوفر لای خەڵك.
٤. بەم شێوەیە (إقامة الحجة)ی تەواو و کامل کارێکی زەحمەت دەبێ.
٥. بەردەوام بوونی تەعەداکردنیان لە ئیسلام و ئازایەتی پەیداکردن بە هۆی بێدەنگیمان.
٦. کاتێکیش جیهاد بەرپا دەبێ بەڵگەکانی جیهاد لاوازتر دەبن وەك لەوەی ئەگەر پێشتر کوفر و ئیسلام لێك جیاکرابن.

هەندێك تەکفیرنەکردن کەمتر دەگەڕێنەوە بۆ تەقواو ترس لە کافربوون بە هۆی تەکفیرەوەو زۆرتر هۆکەی ترسە لە خەڵك و دەسەڵاتداران چونکە تەکفیرکردن وەك وتمان شمشێرێکی تیژە، وەشاندنی شمشێریش جورئەتی پێویستە،لە لایەکی تریشەوە هۆی تەکفیرکردنی کوێرانەش کەمی تەقواو نەبوونی عیلمە، جا بۆ ئەوەی توشی هیچیان نەبین پێویستە زانایان و بانگخوازانی خاوەن عیلم و تەقوا بەم کارە هەڵسن ئەویش بەپێی یەکێك لەم ڕێگایانە :

١. لیژنەیەکی هاوبەشی کۆمەڵە ئیسلامییەکان ئەم کارە بگرێتە ئەستۆ (ئەمەش بەشتێکی خەیاڵیی دەزانم ، بە لای کەمەوە بۆ ئەمڕۆ).

٢. هەر کۆمەڵێك لیژنەیەکی هەبێ (ئەوەش هەروەها ناکرێ چونکە کۆمەڵ هەیە نایکات).

٣. لیژنەیەکی سەربەخۆ (دیسان زەحمەتە).

٤. کۆمەڵێکی ئیسلامیی دیاریکراو، ئەمەشیان عەمەلیترە، بەڵام کێ بەم ئەرکە هەڵسێ ؟ [1]

---

[1] لەمەوە گرنگێتیی هەبوونی مەرجعیەتێکی شەرعی بۆ موسڵمانان دەردەکەوێت کە جێگەی متمانەی موسڵمانان بێت تا لە لایەك تەکفیر فەرامۆش نەکرێت و لەلایەکی تر تەکفیر نەکەوێتە دەستی نەزانان. ئێستاش وای بۆ دەچم کە هەڵسانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی

له کۆتاییداو به کورتی باسی ئەوه دەکەین که تەکفیر چی‌وکیٚ بکەین ؟ دیاره که تەکفیرکردن کەسان و لایەنەکان و ڕێبازەکان دەگرێتەوەو ئاشکرایه که تەکفیرکردنی ڕێبازەکان له هەموو ئەمانە لەپێشترەو لە هەموویان بۆ ئیمانمان سەلامەتترە، چونکه بابەتەکانی ڕێبازەکان ئاشکرا ترو دیارترن ئەویش لەچاو کەسەکان که بەشێکی شاردراوەیان هەیەو پەیوەندیی به دڵ و دەروونیانەوە هەیەو وەکو ڕێبازەکان لەسەر کاغەز نەنووسراوە. بۆ (لایەنەکانیش) کارەکە هەروەك(کەسەکان) زەحمەتە ئەویش به هۆی تێکەڵبوونی کافری (مطلق)و ئەوانەی به نەزانی شوێنی ئەو لایەنانە کەوتوون، بۆیە تەکفیرکردنەکە هەر دەچێتە سەر تەکفیرکردنی ڕێبازەکان ، کاتێکیش که هەموو کەسێك تەکفیر و بەڵگەکانی پێ گەیشت ئیتر (إقامە الحجە)دەکرێ و تەکفیری کەسەکان و لایەنەکان ئاسانتر دەبێ. هەرچەندە پێش ئەوە لایەن و کەسی وا هەن که بە بێ سێ و دوو کافر دەکرێن.

**پاشکۆ**:بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەو بۆ ئەوەی وا نەزانرێت که کاری بانگخوازان تەنها تەکفیرکردنە ئەوە دووبارە دەکەینەوە که تەکفیر هەموو شتێك نییه بەڵکو بەشێکه له تەبلیغ . تەبلیغیش له تەکفیر گرنگترە.بەر لەوەش به کاری تەکفیر هەڵبسین پێویستە تەبلیغی ڕوون و ئاشکرا بکەین.هەڵەیەکی گەورەشە بەر لەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە چی کوفرەو چی ئیمانە حوکمی تەکفیر دەربکەی. زۆر کەس زۆریان لا ئاسانە خەڵك بە کافر له قەڵەم بدەن بەڵام کارێکی ترسناکە لایان به کاری تەبلیغ هەڵبسن ئەویش چونکه تەبلیغ واتای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەسەڵاتداران و لەگەڵ ئەو خەڵکەی که گومڕان و ئەو گەومڕاییەیان پێ خۆشە.هەرچەندە حوکمی تەکفیرکردنی بیروباوەڕو ڕێبازی دیاریکراو بەشێکە له تەبلیغ بەڵام تەبلیغ لەو حوکمە فراوانترە.

## سەرچاوەکان


١. فتح الباری بشرح صحیح البخاری.

٢. صحیح مسلم بشرح النووی.

٣. شرح العقیدة الطحاویة لإبن أبي العز ، تحقیق د.عبدالله بن عبدالمحسن الترکی و شعیب الارناؤوط.

٤. أبو عبادة الانصاری، مفهوم الحاکمیة في فکر الشهید عزام، الطبعة الثانیة ١٤١٤ – ١٩٩٤.

٥. د. یوسف القرضاوی، الصحوة الاسلامیة بین الجحود و التطرف، الطبعة الاولی، ١٤٠٥ – ١٩٨٥.


---

دیاریکراو به تەکفیر ئەوەندەی هەبوونی مەرجعێکی ئیسلامیی باوەڕپێکراو کارێکی بەهێز نییەو وەکو ئەو به تەواوی ئامانجی خۆی ناپێکێت.

# جــيــاوازيى شــەرعـــى

## تێگەيشتن و مامەڵە*

جياوازى لە بيرو بۆچوون و هەڵسوكەوت مەسەلەيەكە ئەمڕۆ و رابردووى پڕكردووە و تا قيامەتيش دەمێنىٚ، جياوازى (الاختلاف)بۆ خۆى دياردەيەكى نائاسايى نييە چونكە خودا مرۆڤەكانى وەكو يەك دروست نەكرووە و ژيرى و زانست و تێگەيشتنى وەكو يەك بەسەر خەڵكيدا دابەش نەكردووە.

ميللەتانى پێش خۆمان لە زۆر شتدا ناكۆك بوون، نەصرانييەكان بۆ نموونە بوونەتە دەيان و سەدان پارچەى سەرەكى و لاوەكى، هەر پارچەو كۆمەڵێكيشيان خۆى بە هەڵگرى هەق دەزانىٚ ئەمەش بە مەرجێك ناكۆكيى ئەوان لەسەر چەند شتێك كەمى عەقيدەيە.

سەرەتاى هەموو جياوازييەكيش ئەوەيە كە ئەسڵێك هەيە، لەم ئەسڵەشەوەو بە هۆى جياوازى لە تواناى تێگەيشتن و بەهۆى ئارەزووەوە جياوازى سەر هەڵدەدات، لە دەرەوەى ئەم جياوازييەشدا چەند شتێك لە ئەسڵەكە دەمێنێتەوە كە ئەو كۆمەڵانە لەسەرى ڕێكن .

لە ئيسلامدا ئەسڵەكە قورئان و سوننەتە، پاش ئەوەش هەنديێك شتى تر بوونەتە سەرچاوە وەكوئيجماع و قياس و قسەى صەحابى...هتد.

زانايانيش لە وەرگرتنى ئەمانە يان وەرنەگرتنيان و چۆنێتيى وەرگرتنيان جياوازاييان لە نێواندا هەبووە، تەنانەت قورئان و سوننەتيش كە هەمووان ڕێكن لەسەر ئەوەى سەرچاوەى يەكەمن زانايان وەكو يەك نەبوون لە تێگەيشتن لە دەقەكان و ووشەكان و چۆنێتيى مامەڵە كردن لەگەڵ ئەو دەقانەدا ..هتد.

ئەوەشى گرنگە بيكەينە ڕێبەرى مامەڵە كردنمان لەگەڵ يەكتردا لە مەسەلەى جياوازيدا ئەوەيە بزانين كەوا :

١- جياوازى هەبووەو هەر دەمێنێت.

٢- پێويستە جياوازى لەسەر ئەساسێكى شەرعى بێت.

٣- ڕەوشتى بەرزى موناقەشە لەنێوان هەڵگرانى بۆچوونە جياوازەكاندا بپارێزرىٚ.

### جياوازى لە نێوان صەحابييەكاندا

جارو بار جياوازى بيرو ڕا دەكەوتە نێوان صەحابييەكان، پێغەمبەريش (ﷺ) لايەنى هەقى ڕوون دەكردەوە بۆيان، پاش وەفاتى پێغەمبەريش (ﷺ) صەحابييەكان بەگەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت چارەسەرى جياوازييەكانيان دەكرد، نموونەش لە سەر ئەوە :

١- (بوخارى) و( موسلم) ريوايەتيان كردووە كەوا پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزوەى (بەنو قورە يضە) فەرمانى دا كەس نوێژى عەسر (لاى موسلم : نوێژى نيوەڕۆ) نەكات لەناوچەى (بەنو قورە يضە) نەبێت، واتە نوێژەكەيان بۆ ئەوىٚ هەڵگرن ، لە ڕێگەشدا كاتى نوێژەكە هات و هەنديێك صەحابى وتيان فەرمانى پێغەمبەر(ﷺ) بەجىٚ دەهێنين و نوێژەكە ناكەين تا دەگەينە (بەنو قورە يضە)، ئەوانەى تريش نوێژەكەيان كردو وتيان پێغەمبەر(ﷺ) تەنها مەبەستى ئەوە بوو پەلە بكەين، پاشان كە پێغەمبەر(ﷺ) بەمەى زانى سەرزەنشتى هيچ لايەنێكيانى نەكرد (صحيح البخاري / كتاب المغازي و صحيح مسلم / كتاب الجهاد والسير).

٢- پاش وەفاتى پێغەمبەر(ﷺ) زوربەى زۆرى عەرەب لە ئيسلام هەڵگەڕانەوە و هەندێكيشيان بەو رازى نەبوون كە زەكات بدەن،(ئەبو بەكر)يش كە بڕيارى دا شەڕيان لەگەڵدا بكات (عومەر) ووتى : چۆن شەڕ لەگەڵ كەسانێك بكەين كە وشەى (لا الە الا اللە) دەڵێن ئەويش وتى : من شەڕ لەگەڵ ئەوانە دەكەم كە نوێژو زەكات لە يەك جيا دەكەنەوە، پاشان (عومەر) قەناعەتى بە راكەى (ئەبو بەكر) هێنا (صحيح مسلم / كتاب الايمان). واتە بەڵگەى (ئەبو بەكر) ئەوە بوو زەكات بەشێكە يان ئەركێكە لە ئەركەكانى (لا الە الا اللە).

* گۆڤارى ڕابەر، ژمارە ٣٥، هاوينى ١٩٩٨، ل ٢٨-٣٣.

لەم دوو نموونەیە ـ دەیان نموونەی تریش هەن ـ دەردەکەوێ کە خیلاف و جیاوازی جاروبار رووی دەکردە صەحابییەکان ئەوانیش بۆ چارەسەر دەگەڕانەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی ژیانیدا یان بۆ قورئان و سوننەت پاش وەفاتی (بۆ نموونەی تر بڕوانە: ادب الاختلاف في الاسلام، ل ٥٠ بەدواوە).

ئەم جۆرە جیاوازییانەش هەر روویان دەدا هەرچەندە پێغەمبەر ووریای کردبوونەوە لە جیاوازی، بۆ نموونە فەرموودەی (اقرؤا القرآن ما ائْتَلَفَتْ عليهِ قلوبكم فاذا اختلفتم فقوموا). (صحيح البخاري / كتاب فضائل القرآن وكتاب الاعتصام و صحيح مسلم / كتاب العلم).
واتە : تا دڵەکانتان لە سەر ئەو قورئانە ڕێك بێ بیخوێننەوەو ئەگەر جیاوازیتان بۆ دروست بوو لە بارەیەوە (واتە لەبارەی تەفسیرو جۆری خوێندنەوە) هەڵسن و بەجێی بێڵن. ئەمە لەگەڵ چەند فەرموودەیەکی تر، صەحابییەکانیش ئەو پەڕی هەوڵیان دەدا کە جیاوازییان بۆ دروست نەبێت و وەکو وتمان هەر کاتێك شتی وای رووی بدایە چارەسەریان دەکرد.

کەمی جیاوازیش لە نێوان صەحابییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك وەکو : سەرەتا لە یەك ولاتدا پێکەوە دەژیان بۆیە بە ئاسانی کۆدەبوونەوە، خەلیفە لە مەسەلەکاندا پرسی پێ دەکردن ، سیاسەت ملکەچی فیقھ بوو، کەمیی کێشەکانی سەردەمیان، هتد...(بڕوانە : د. مصطفى الزلمي / اختلاف الفقهاء ل، ٢٣).

## جیاوازی لە سەردەمی تابعییەکاندا

(تابعی) ئەو موسڵمانەیە کە صەحابیی بینیوە، لەو سەردەمەشدا دیسان جیاوازی هەبوو، بەڵکو زیاتریش بوو چونکە لە کاتی حوکمی (عوثمان)دا صەحابییەکان بە ناو ولاتاندا بڵاوبوونەوە (پێشتر عومەر ڕێی پێ نەدەدان لە دەرەوەی مەدینە نیشتەجێ بن) . لەبەر ئەوەشی هەر کۆمەڵە صەحابییەك بەشێکی علمەکەیان پێ بوو، خەڵکی ئەو ولاتەی صەحابییەکە بۆی چووبوو ئەو بەشە علمەیان دەست کەوت ، بۆیە شتێکی ئاسایی بوو جیاوازی نێوان ولاتان بێتە کایەوە.

لە سەردەمی تابعییەکان و لە سەردەمی تابعیی تابعییەکاندا مەزهەبە فیقهییەکان پەیدا بوون و جیاوازی هەیە لە نێوان هەردوو قوتابخانەی (رأی) کە زۆر کاری بە (قیاس) دەکردو قوتابخانەی (أثر) کە زۆر تر کاری بە فەرموودە دەکرد. لە سەردەمی گەشەکردنی فیقهیشدا ژمارەی مەزهەبەکان زیادی کرد ، وتراویشە کەوا مەزهەبەکان گەشتنە پێنج سەد مەزهەب (د.مصطفى الزلمي، اسباب اختلاف الفقهاء، ل ٢٨).

لە سەدەی چوارەمی کۆچیشدا تەقلید خۆی سەپاند و ئجتیهاد کەم بووەوە تا دوایی بە تەواوی دەرگای ئجتیهاد داخرا، بەڵام جیاوازییەکە توندتر بووەوە، چونکە دەمارگیری ئەنجامێکی تەقلیدو خۆبەستنەوەیە بەیەك مەزهەبەوە، بەم شێوەیەش لە جیاتی ئەوەی جیاوازی بێتە هاندەر بۆ پێشخستنی علم جیاوازییەکە بووە هۆی دوا خستنی علم وزیادکردنی ناکۆکی.

شایەنی وتنە کە جیاوازی لەسەر ئاستێکی تری غیری فیقھ و فەرموودە هەبوو ئەویش ئاستی عەقیدە، بەڵام لەکاتێکدا جیاوازیی فیقهی بەزۆری لە نێوان (أهل السنة و الجماعة) خۆیاندا بوو، دەبینین کە خیلافی عەقیدەیی لە نێوان (أهل السنة و الجماعة)لە لایەك و ئەهلی بیدعەو گومڕایی لە لایەکی تر بوو.

## جیاوازییەکانی ئەمڕۆ

ئەمڕۆ و پاش سەردەمەکانی دواکەوتنی ئوممەتی ئیسلامی کۆمەڵێکی زۆری موسڵمانان روویان کردۆتەوە دینەکەی خوداو هەوڵ دەدەن علمیان دەست بکەوێ، بەڵام وە نەبێ جیاوازی بەرپا نەبووبێ لە نێوانیاندا ، بۆ نموونە:

١. جیاوازی هەیە لە نێوان کۆمەڵە ئیسلامییەکان لە مەسەلەی مامەڵەکردن لەگەڵ عەلمانییەکان و لەگەڵ خەڵکی سادەدا.
٢. جیاوازی لە مەسەلەی چۆنیەتی دەستکەوتنی حوکم.
٣. جیاوازی لە حەرامێتیوحەڵاڵێتیی پێکهێنانی کۆمەڵی ئیسلامی (کاری تەنزیمی) تەنانەت لە مەسەلە فیقهییەکانیشدا جیاوازی هەیە، بۆ نموونە :

أ ــ شێخ ئەلبانی کە هەندێك لاو تەقلیدی دەکەن وای بۆ دەچێ لە مەسەلەی چوون بۆ سوجدە پەسەندترە دەست بخرێتە سەر زەوی پێش ئەژنۆ لە کاتێکدا شێخ (بن باز) پێچەوانەکەی بە پەسەند دەزانێ.

ب ــ ئەلبانی دروست کردنی خەتێك لە بەردەم نوێژکەر بە (سترە)نازانێ و فەرموودەیەك لەم بارەیەوە کە لە لای (ئەبو داوود)دا هەیە بە (ضە عیف)ی دادەنێ، لە کاتێکدا (بن باز) ئەو فەرموودەیە بە (صەحیح) دەزانێ و قسەی (ابن حجر) لەم بارەیەوە دەهێنێتەوە (الشيخ عبدالعزيز بن باز، فتاوى اسلامية، بەرگی یەکەم).

ج – هەندێك دەڵێن كە خێری قورئان خوێندن بە مردوو ناگات (بن باز ، فتاوى إسلامية ل ١٠٨)و ئەمە بە بیدعە دەزانن، لە كاتێكدا هەندێكی‌تر وەكو (إبن تيمية) و (إبن القيم) لە كۆنەكان ، بڕوانە : الجداول الجامعة، بەشی عەقیدە) دەڵێن كە خێرەكەی دەگات، یەكێكی تریش دەڵێت نابێ بكرێ، بەڵام ئەگەر جاروبار كردی (انكار)ی لەسەر ناكرێ (ابن جبرين، فتاوى إسلامية ل ٥٩) ئەمەش هەمووو لەبارەی خوێندنی قورئانی بۆ مردوو وبێ پارە و موقابل.

مەسەلەی زۆری تریش لەسەر جیاوازیی نێوان زاناكان هەن هەرچەندە هەموویان خۆیان بە شوێنكەوتووی ڕێبازی سەلەف دەزانن و هەموویان خۆیان بە دەلیلەوە بەستۆتەوە.

## ئەو شتانەی كە نابێ جیاوازییان تێدا هەبێ

كەواتە جیاوازی هەر هەیە (دوایش باسی هۆكانی دەكەین) بەڵام هەندێك شت هەن كە نابێت بە هیچ جۆرێك خیلافیان لەبارەوە هەبێ، ئەوانیش :

١. ما هو معلوم من الدين بالضرورة: واتە ئەو شتانەی كە دەبێ هەموو كەسێك بیانزانێ‌و كەس عوزری نییە ئەگەر لێیان بێ ئاگا بێ وەكو : ژمارەی ركعاتەكانی فەرزەكان.

٢. ئەو دەق و بەڵگانەی كە (قطعي الورود و قطعي الدلالة)ن : (قطعي الورود)یش واتە گومان لەوەدا نییە كە لەلایەن خواوە هاتبێ وەكو قورئان و لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتبێ وەك فەرموودەی (موتەواتر). (قطعي الدلالة)یش ئەوەیە دەقەكە تەنها یەك واتا هەڵدەگرێت و ڕێ نییە بۆ ئەوەی واتایەكی تری پێ ببەخشرێ وەكو : ئایەتی (و أقيموا الصلاة و آتوا الزكاة)... هتد.

٣. ئەو مەسەلانەی ئیجماعی موجتەهیدان و زانایانی موسڵمانانیان لەسەر بێ وەكو ئیجماع لەسەر دانانی ئیمام و پێشەوا بۆ پاراستنی ئایین.. هتد. (بۆ ئەم سێ مەسەلەیە بڕوانە : محمد علي عجلان، مالا يجوز الخلاف فيه بين المسلمين ل (١٣- ١٧) ).

واش بە چاك دەزانین بە كورتی قسەی (إبن تيميه)بهێنینەوە لە بارەی جۆرەكانی ئختلاف، (أقتضاء الصراط المستقيم ل ٣٦ بە دواوە).
شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە دەڵێ : ئەو ئختلافەی كە خوا لە قورئاندا باسی كردووە دوو جۆرە : لە یەكەمیاندا خوا هەردوو كۆمەڵەكە زەم دەكات وەك دەفەرمووێ : ﴿ولا يزالون مختلفين ، إلا من رحم ربك﴾(هود : ١١٨ – ١١٩) دووەمیشیان ئەوەیە كە ستایشی یەكێك لە دوو كۆمەڵەكەی كردووە ئەوانیش ئیماندارەكان و زەمی كۆمەڵەكەی تری كردووە : ﴿و لكن أختلفوا فمنهم من آمن و منهم من كفر﴾(البقره:٢٥٣).

لەبارەی ئەو ئختلافەش كە نابێ ببێتە جێگەی ئاژاوە دەڵێ : جۆرەكانی ئختلاف دوانن : (جیاوازیی هەمە جۆری ــ اختلاف التنوع)و (جیاوازیی دژایەتی ــ اختلاف تضاد)جۆری یەكەمیشیان چەند ڕوویەكی هەیە، یەكێك لەوانە ئەوەیە كە هەردوو قسەكە یان كردارەكە ڕاستن وەكو (قِراءات)ی قورئان، واتە ئەو چەند جۆرە خوێندنەوەی هەندێك پیت و وشەی قورئان – پێغەمبەریش بەو دوو صحابییەی (كە بە دوو شێوەی جیاواز ئایەتەكانیان خوێند بووەوە) فەرموو : هەردووكتان باشتان كردووە، واتە هەردووكیان ڕاست بوون .

جۆرێكی تر ئەوەیە كە واتای هەر یەكێك لە دوو قسەكە لەوەی تری دەچێ، بەڵام وشەكانیان جیاوازن.جۆرێكی تر ئەوەیە كە دوو واتاكە دوو شتن بەڵام دژ بە یەك نین.

جۆرێكی تریش ئەوەیە دوو ڕێگای ڕەوا هەن و كابرایەك یان كۆمەڵێك یەكێكیان دەگرێتە بەرو ئەوانی تر ڕێگاكەی تر هەڵدەبژێرن و هەردووكیشیان باشن.

جۆری (جیاوازیی دژایەتی) یش ئەوەیە دوو قسەی دژ بە یەكن، مەسەلەكەش لێرەدا خراپترە، بەڵام زۆر جار نەختێك هەق لە قسە ناهەقەكەدا هەیە یان خاوەنەكەی بەڵگەیەكی بەدەستەوەیە، بەڵام خاوەنی قسە هەقەكە ئەم نەختە هەقەش ڕەت دەكاتەوە، پاشان ئیبنو تەیمییە دەڵێ :

لە جۆری (جیاوازیی هەمە جۆری)دا هەریەكێك لەسەر هەقە بەڵام زەم كردنەكە ڕوو دەكاتە ئەو كەسەی تەعەدا لەوی تر بكات، (لێرەدا قسەكانی شێخی ئیسلام بە كورتی تەواو بوون).

ئەم تێكەیشتنەشە وای لە زانایانی گەورەی ئیسلام كرد بڵێن (بۆ چوونەكەم *ڕاستە، بەڵام ڕێی تێ دەچێ هەڵە بێ و بۆچوونی بەرامبەرەكەشم هەڵەیە بەڵام ڕێی تێ دەچێ ڕاست بێ)*، هەروەها ئەمە بوو وای لێكردن (هەرچەندە جیاوازییان لە نێوان یەكتردا هەبووە) ڕەحمەت بۆ یەكتر بنێرن و قەدری یەكتر بزانن و چاوپۆشی لە هەڵەی یەكتر بكەن.

## هۆكانی جیاوازی

**هۆی زۆر هەن بۆ جیاوازی لەنێوان زاناكاندا :**

**١- هەندێك وشە دوو واتای هەیە كە هەردووكیان راستەقینەن (حقیقی) وەكو (قُرء) كە هەردوو (حیض) و پاكبوونەوە لە (حیض) دەگرێتەوە، هەندێك زانا واتای یەكەمیان وەردەگرن و هەندێكی تر واتای دووەم.**

**٢- هەندێك وشە هەن واتایەكی راستەقینە و واتایەكی مەجازییان هەیە ،بۆ نموونە كە دەڵێیت : (شێرێكم بینیوە) دوو واتا بۆ ئەم قسەیە هەیە ، یەكەمیان شێرێكی راستەقینەت بینیوەو دووەمیان : پیاوێكی ئازا وەكو شێر .**

**٣- وشەی تر هەن كە لە زمانی عەرەبیدا واتایەكیان هەیە، بەڵام لە شەرعدا واتایەكی تر دەبەخشن.**

**٤-ئایا حوكمە (عام)ەكانی قورئان دەكرێن بە (خاص) بەهۆی فەرموودەی(احاد)ەوە؟**

**٥- وشەیەك لە شوێنێكدا بە (مطلق)ی دێت بەڵام لە شوێنێكی تردا بە (مقید)... ئایا موقەییدەكە بەسەر موطلە قەكەدا دەسەپێنرێ ؟**

**٦- (مفهوم المخالفة) هەیە ـ كە چەند جۆرێكە ـ وكە هەندێك زانا كاری پێ ناكەن و هەندێكی تر وەریدەگرن ، ئەمانەش لە نێوان خۆیاندا لەبارەی هەندێك جۆریەوە ناڕێكن لە وەرگرتن یان وەرنەگرتنیان. نموونەیەك لەسەر جۆرێكی (مفهوم المخالفە) ئەو فەرموودەیەی باسی زەكاتدان لەو ئاژەڵەی لە دەشتودەر دەلەوەڕێ دەكات . بە رەچاوكردنی فەرموودەكەو بە وەرگرتنی (مفهوم) دەبێت ئەو ئاژەڵەی ئالیكخۆر زەكاتی نەكەوێ.**

**٧- ئایا كار بە فەموودەی (مورسەل) دەكرێت ؟ئەی مەرجەكانی كارپێكردنی چین ؟ جیاوازی لەم بارەیەشەوە هەیە. فەرموودەی (مورسەل) ئەوەیە كە تابعی (تابعیش كەسێكە پێغەمبەر (ﷺ)ی نەبینیوە بەڵام صەحابیی بینیوە) ناوی صەحابییەكە نالێ، بەڵكو یەكسەر دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ (لە بارەی پێناسەی مورسەلیش دیسان خیلافێكی كۆن هەیە).**

**٨- دەلیلەكە گەشتووە بە دەستی زانایەك و نەگەیشتۆتە دەستی زانایەكی تر.**

**٩- زاناكە بەڵگەكەی لەیاد دەچێ وەك چۆن (عومەر) فەرموودەیەكی لەبارەی (تەیەمموم)ەوە لە یاد چووبوو و (عەممار كوڕی یاسر) خستییەوە یادی (بەڵام هەر بیری نەكەوتەوە).**

**١٠- جیاوازی لە وەسف و چۆنێتیی (ئیجماع).**

**١١- كار كردن یان كار نەكردن بە (قیاس) و (استحسان) و(المصالح المرسلة) و (استصحاب)...هتد كە ئەمانە سەرچاوەی سەرەكی نین بۆ حوكمە شەرعییەكان.**

**ئەمانە – زۆر بە كورتی – بەشێكن لە هۆكانی جیاوازی (بڕوانە بەش یەكەمی كتێبی هاشم جمیل، مسائل في الفقة المقارن، بەرگی یەكەم، هەروەها كتێبەكەی د. مصطفى الزلمي لەمانەش كورتتر؛ كتێبی طه جابر، أدب الاختلاف في الاسلام، هەروەها كتێبەكەی ابن تیمیة، رفع الملام عن الأئمة الاعلام).**

**ئەگەر بێت و هەموو هۆكانی جیاوازی بزانین ئەو كاتە دەزانین ئاستی زانستیی دەمارگیرەكان چەند نزمە ، هەروەها دەزانین هەژاریی زانستیی ئەو كەسانە چەندە كە وا دەزانن علم هەمووی لای زاناكانی خۆیاندا كۆبووەتەوە ، ئەمەش تەنها ئەمانە ناگرێتەوە كە شوێن كەوتووی یەكێك لە مەزهەبەكانن و دەمارگیرن بۆی ،بەڵكو ئەوانەش دەگرێتەوە كە تەقلیدی زانا نوێكان دەكەن ، بۆ نموونە زۆر كەس (چونكە بێ ئاگان لە زانای ترو بێ ئاگان لە علم بە گشتی) دڵیان ئاو ناخواتەوە تا شێخ ئەلبانی بە فەرموودەیەك نەڵێ (صەحیح)ە یان (ضە عیف)ە بەمەرجێك رەخنەی زۆر و هەڵەی زۆر لە ئەلبانی گیراوە (بۆ نموونە بڕوانە :حبیب الرحمن الاعظمي : الالباني:شذوذه و أخطاءه هەروەها حسن بن علی السقاف، تناقضات الالباني الواضحات)، هەتا ئەگەر (ابن حجر)یش ئەو فەرموودەیە بە (صەحیح) بزانێ ،ئەو قوتابییانە قەناعەت ناكەن تا نەزانن ئەلبانی چی دەڵێ بەمەرجێك جیاوازیی نێوان ئەلبانی و (ابن حجر) وەكو جیاوازیی نێوان زەوی و ئاسمانە، ئەوەش بێگومان بێ ئەوەی لە قەدری علمی ئەلبانی كەم بكەینەوە.**

## ڕەوشتی جیاوازی (أدب الاختلاف)

ئەگەر مەبەست لە علم وەرگرتن و بلاوکردنەوەی پاداشتی خودا بێ ئەوا رەفتارو رەوشت لە کاتی جیاوازیدا دەگاتە ئاستێکی بەرز، لەڕاستیشدا ئەوەی هەندێك کتێب دەخوێنێتەوە قسەی ناشرینیان زۆر تێدا دەبینیٚ، ئێمەش نالێین کە علمی ئەو کەسانە بۆ خودا نییە، چونکە ئەمە شتێکە خودا خۆی دەیزانیٚ بەلام دەلێین کەوا لەو موناقەشانەدا بەشێکی نەفسیان تێدا هەیە، بۆ نموونە هەلەی زۆر لە ئەلبانی گیراوە، بەلام رەخنەکان قسەی ناشیاویان تێدایە وەکو قسەی (حبيب الرحمن الاعظمي) لە (الالباني.. شذوذه و أخطاؤه) یان قسەکانی (حسن بن علی السقاف) لە (تناقضات الالباني الواضحات)، ئەلبانیش وەك کاردانەوە قسەی خۆی وتووە. واش بزانین کەوا ئەو هێرشە لە سەر ئەلبانی لەبەر ئەوەیە لە (السلسلة الضعيفة)یدا بە ئەدەبەوە باسی ئیمام ئەبو حەنیفەی کردووە کە راستگۆیە، بەلام قسەی هەندێك کەسی هێناوەتەوە کە ئەبو حەنیفە توانای لەبەرکردنی کەمە بۆیە لە فەرموودەدا (ضه عيف)ە ئەوانەش کە قسەیان بە ئەلبانی وتووە لە سەر مەزهەبی ئەبو حەنیفەن، بەلگەش لەسەر ئەوە قسە وتن بە (ئیبنو حەزم) و (دارقوطني) چونکە بە قسەی (حبیب الرحمن) دوژمنی ئەبو حەنیفەن، بەلام هەموو زاناکانیش وا نین ، بۆنموونە کابرایەك لەگەل کۆمەلێکی ئیسلامی کاری دەکردو دوایی کە وازی لێ هێنان بە نووسین داوای لە (ابن باز) کرد فەتوا دەربکا کە ئەمانە بیدعەچین ئەویش بەوە وەلامی دایەوە بە نامەکەی دلخۆش نەبووە ، چونکە ئەم رێگایە تێکدەرەو ئامۆژگاریی دەکات کە لەگەل موسلماناندا نەرم بێت.. هتد. (بڕوانە : عبد الرحمن بن عبد الخالق، الرد الوجيز، ل ٣٠ بە دواوە) ، هەروەها (بن باز) ئامۆژگاریی ئەو کەسانە دەکات کە قسە بە بانگخوازان دەلێن، لە بارەی جیاوازیشەوە دەلیٚ کەوا ئەگەر مەسەلەکە رێی (اجتهاد)ی تێدا بوو خاوەنی ئیجتهادەکە هیچی لە سەر نییە، ئەگەر یەکێکیش موخالەفەی کرد با بە شێوەیەکی باش بێت و بیٚ هێرش بردنەسەرو بیٚ بریندارکردن یان قسەی زیادەی ناپێویست ....هتد. (سەرچاوەی سەرەوە ل ٤٨).

لە راستیشدا قسەی توندو تیژو ناشیاو لەناو کۆنەکانیشدا هەروا هەبووە، بەلام زانا بەرزەکان تەنها ئەو قسانەیان بەو کەسانە وتووە کە شایەنی بن ئەویش بە مەبەستی (جەرح) واتە پلەی راستگۆیی یان لەبەرکردنی فەرموودە. لێرەشدا بە کورتی هەندێك نموونە لەسەر رەوشتی بەرزی زاناکان بەرامبەر یەکتر دەهێنینەوەوکەمێك باسی ئەوە دەکەین کە چۆن دەیانڕوانییە یەکتر:

١. باسمان کردبوو کە جیاوازیو رەخنەی زۆر لە نێوان قوتابخانەی (رأي)و قوتابخانەی (أثر)دا هەبوو بەلام کەس لە شوێنکەوتوانی دوو قوتابخانەکە لە سنوورەکانی رەوشتی جیاوازی دەرنەچووبوو ، نە یەکتریان بە فاسق یان داهێنەری (مونکەر) زانی و نە کەسیان حاشای لەوی تر دەکرد (أدب الاختلاف ل ٨٣).

٢. ئیمام (لە یث کوری سە عد)ئیمام (مالك)ی بینیو ئەویش وەسفی ئیمام ئەبو حەنیفەی بۆ کرد کە (فقیە)ە واتە زانایە پاشان ئەبو حەنیفەی بینی ئەویش ووتی : کەسم نەبینیوە لە مالك خێراتر لە وەلامی راستگۆ و رەخنەی تەواو (هەمان سەرچاوە ل١٥٢) واتە مەدحی یەکتریان کردووە.

٣. لە ئیمام ئەحمەدیان پرسی : ئەگەر یەکێك بیەویٚ فەرموودەی تەنها کەسێکی دیاریکراو لەبەر بکات، هی کیٚ لەبەر بکات ؟ ئەویش ووتی : با فەرموودەکانی مالك لەبەر بکات (هەمان سەرچاوە ،ل ١٢٧).

٤. ئیمام شافیعیش دەلیٚ : مالك مامۆستای منە و لەوەوە علمم وەرگرتووە، ئەگەر باسی زاناکانیش کرا ئەوا مالك لە ناویاندا ئەستێرەیە (هەمان سەرچاوە ، ل ١٢٧).

٥. قسەیەکی ناوداری شافعیش هەیە لەبارەی ئەبو حەنیفەوە ئەویش : الناس في الفقه عيال على أبي حنيفة، واتە خەلکی لە فیقهدا موحتاجی ئەبو حەنیفەن.

٦. (یەحیا کوری سەعیدی قە ططان) کە زانایەکی پایە بەرزی فەرموودە بوو دەیوت : من دوعا بۆ شافیعی دەکەم هەتا لە نوێژەکانیشمدا (سەرچاوەی سەرەوە ،ل١٣٠).

٧. (ئیسحاق کوری راهەوەیە ) کە شێخی بوخاری و موسلمە دەلیٚ : رۆژێکیان (ئەحمەد کوری حەنبەل) م بینی وتی : وەرە پیاوێکت پیشان بدەم کە چاوەکانت کەسی وای نەبینیوە... ئینجا (شافعی)ی پێشان دام ... (سەرچاوەی سەرەوە، ل١٣٢).

٨. له مەزهەبی ئیمام ئەحمەد ئەوە هەیە کە دەست نوێژ لە لووت بڕان دەشۆرێتەوە، یەکێکیش لێی پرسی ئەگەر خوێن لە ئیمامەکەوە دەرچێت و دەست نوێژ نەگرێتەوە نوێژ لە دوایدا بکەم ؟ ئیمام ئەحمەدیش وتی : من چۆن نوێژ لە دوای ئیمام مالك و سعید کوڕی المسیب ناکەم ؟ (سەرچاوەی سەرەوە ل ١١٦ –١١٧). ئەم دوانەش لایان وابوو کە خوێن دەست نوێژ ناشکێنێت.

٩. (تەهانەوی) لە نوێکان بەراوردی لە نێوان (إبن تیمیە)و (الطَحَّاوی)دا دەکات و وشەیەك لە هەقی ئیبنو تەیمییە بەکار دەهێنێ کە لە هندستاندا باوەو واتای سووکایەتی نابەخشێ ئەویش : ئیبنو تەیمییە نابێ بە خۆڵی نەعلەکانی(طَحَّاوي). شێخ (عبدالفتاح ئەبو غودده) ش نامەی لەم بارەیەوە بۆ دەنێرێ ئەویش وەڵامی دەداتەوە کە بە برادەرێکی وتبوو ئەم وشەیە بکوژێنێتەوەو بنووسن کە نووسەرەکە لەم قسەیە پەشیمانەو داوای لێخۆش بوون لە خودا دەکات لەم بێ ئەدەبییەەرامبەر ئیمامەکانی ئیسلام کە شێی ئیسلام ئیبنو تەیمییە یەکێکیانە رەحمەتی خودای لێ بێت...هتد. (قواعد علوم الحدیث، ل ٤٤١–٤٤٢). پاش ئەوەش هەر خۆی وشەکە بۆ خۆی بەکار دەهێنێ کاتێك رەخنە لە قسەیەکی (ابن قیم الجوزیة) ــ قوتابیی ئیبنو تەیمییە ــ دەگرێ. (تەهانەوی) پاش رەخنەکە دەڵێت : مەبەستم لەم قسانە تەنها بەر پەچدانەوەی (ابن القیم)نەبووە رەحمەتی خودای لێ بێت چونکە ئەو بەرێزترو گەورەترە لەوەی یەکێکی وەکو ئێمە قسەی لە بارەوە بکات، چونکە ئەگەر ئێمە ببینە خۆڵی نەعلەکانی (ابن القیم) ئەمە پایەمان بەرزتر دەکاتەوە.....هتد. (سەرچاوەی سەرەوە ل ٤٦٠–٤٦١) هەرچەندە (ابن تیمیە) و قوتابییەکەی(حەنبەلی)ن و (تەهانەوی) لەسەر مەزهەبی ئیبنو حەنیفەیە.

چەند رێنموونییەك هەیە لە رەوشتی جیاوازیدا کە لێرەدا تەنها باسی هەندێکیان دەکەین :

١- پاراستنی زمان : لە کاتی رەخنە لە هەر بۆ چوونێك مرۆڤ خۆی لە توندو تیژی و هەڵەکانی زمان بپارێزێ، مەبەستیشمان زیاتر ڕەخنە لە موسڵمانە ئەگینا ملهوڕەکانی ناو بێ باوەڕەکان پێویستیان بە شێوازێکی توندو تیژی رەخنەیە، ئایەتە مەککییەکانی قورئان و زۆر لە ئایەتە مەدەنییەکان بەڵگەن لەسەر رەخنەی توندو تیژ لە بێباوەڕە ملهوڕەکان. لەسەر ئاستی موسڵمانانیش زمانی هێمن و زمانی پاك زۆر پێویستە، چونکە مەسەلە خیلافییەکان ئسلوبی پێچەوانە هەڵناگرن جگە لەوەی کە مەبەست لە رەخنەو دەربڕینی بۆچوون ئاشکرا کردنی هەقە،پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێ (ئایا خەڵك کە بەسەر دەموچاودا لەناو جەهەنەمدا دەخرێن بەهۆی دروێنەی زمانی خۆیان نییە ؟) (أحمد و ترمذي وابن ماجة، ریوایەتیان کردووەو بەهۆی هەموو (طریق) ەکانی صەحیحە، ریاض الصالحین بتحقیق شعیب الارناؤوط ١٢/ ١٥٢٢).

خوای گەورەش بەر لەوە دەفەرمووێ :﴿ قل لعبادي يقول التي هي أحسن إن الشيطانَ ينزغُ بينَهُم﴾(الاسراء :٥٣)، واتە بڵێ بە بەندەکانم ئەو شتە بڵێن کە باشترو جوانترە، چونکە شەیتان بەینیان تێك دەدات.

٢- کلیلێکی تێگەیشتن لە جیاوازیی شەرعی ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرمووێ:(ئەگەر حاکم ئجتیهادی کردو راستی کرد لای خودادا دوو پاداشتی هەیەو ئەگەرئجتیهادی کردو هەڵەی کرد یەك پاداشتی دەست دەکەوێت) (صحیح البخاری ــ کتاب الاعتصام، صحیح مسلم ــ کتاب الاقضیة). بەم شێوەیە ئەگەر موسڵمانێك کە ئەهلی ئیجتیهادە لە مسەلەیەکدا توانای خۆی لە ئیجتیهادێکدا سەرف کردو هەڵەی کرد لای خودا گوناهبار نییە، بەڵکو پاداشتی هەیە بۆیە دەبێ ئێمە رێزی لێ بگرین چ جای ئەوەی ئەگەر بۆچوونەکەی لەو جۆرەیە کە (ابن تیمیە) باسی کردووە کە هەڵە نییەو بۆ چوونی بەرامبەرەکەشی دیسان هەڵە نییە.

## جیاوازیی بۆچوون و تۆقاندنی فیکری

تۆقاندنی فیکری شتێکی نوێ نییە، لە ئیسلامیشدا لەبەر ئەوەی مەسەلە خیلافییەکان ژمارەیەکی زۆرن زانایان – وەك ووتمان –بەرامبەر یەکتر سنگ فراوانییان دەنواند ، بەڵام لە رۆژانی داخستنی دەرگای ئیجتیهادەوە خەڵك خۆیان بە مەزهەبەکانەوە بەستەوەو کەمێکیان نەبێ لە مەزهەبەکە لایان نەدا هەتا ئەگەر دەلیلێکی راستیش لە سەر هەڵەی رایەکی دیاریکراوی ئەو مەزهەبە هەبووبێ. شتێکی ئاساییشە کە لە کەشوهەوایەکی وەهادا دەمارگیری تەشەنە بکات، هەروەها شتێکی ئاسایی یە تۆقاندنی فیکری سەر هەڵبدات. موسڵمانان لەم تۆقاندنە فیکرییە دوور بوون ئەگەر لەگەڵ رۆژئاوادا بەراووردیان بکەین و کە لەوێدا حاڵ گەیشتە ئەوەی کە نەیارە ئاینییەکان بە کۆمەڵ لەناو ببرێن و ژمارەیەکی زۆریان بسووتێنرێن وەك چۆن لە فەرەنسادا ــ ئەمەش تەنها نموونەیەکە ــ لە یەك قەسابخانەدا لە ساڵی (١٥٧٢) دا دە هەزار پرۆتستانت مەزهەب لە پیاوو منداڵ و ئافرەت لەناو بران.

زانا گەورەکانی ئیسلام لە تۆقاندنی فیکری و مەزهەبی دوور بوون، ئەوەتا ئەبو حەنیفە دەڵێ : (ئەوەی ئێمە لەسەرین ـ واتە راکانی ـ ران و کەسیان لەسەر ئیجبار ناکەین و ناڵێین کە دەبێ هەموو کەسێك بە ناچارییەوە پێیان رازی بێت ، هەر کەسێکیش شتێکی باشتری هەیە با بیهێنێت) (أدب الاختلاف، ل ٧٥)، یان ئیمام مالك کە سێ خەلیفەی عەبباسی داوایان لێ کرد کتێبەکەی (الموطأ)ی بۆ بڵاوبکەنەوە بە ناو جیهانی ئیسلامیداو بەسەر موسڵماناندا بیسەپێنن بەڵام ئەو رازی نەبوو، چونکە بە وتەی خۆی خەڵکی وڵاتانی تر بەشی خۆیان لە علم هەیەو نابێ بەزۆر داوایان لێ بکرێ واز لەو علمەی لایانە بهێنن .

رووداوە خراپەکانیش تەنها لە نێوان ئەو کەسانەدا بوو کە کوێرانە تەقلیدیان دەکرد، هەروەها (بەڵام بە رادەیەکی گەورەترو خراپتر، ئەمەش بۆ خۆی یاسایەکی گشتییە) لە نێوان ئەو کەسانەدا بوو کە شوێنی ئارەزوو کەوتبوون وەك بەشێك لە موعتەزیلە کە فتنەیەکیان لە بارەی مەسەلەی (خلق القران)ەوە بەرپا کردبوو و کە دەبوایە هەموو زانایەك قسەی ئەوانی بکردایەو بیوتایە کە قورئان خەلق کراوە (واتە وەکومەخلوقاتی تر دروست کراوە) ئەگینا دووچاری سجن و ئازاردان دەبوو ، یان خەوارج (کە یەکێك لە بیروراکانیان ئەوە بوو ئەو کەسەی گوناهی گەورە دەکات کافرە) ئیرهابێکی فیکرییان بەرپا کرد بەوەی ئەو کەسانەیان بە کافر دەزانی کە لەسەر بیروباوەڕەکەی ئەوان نەبوون و تەنانەت هەندێکیان دەیانوت کەوا ئەو کەسەی بیروبۆچوونی ئەوانی هەبێ بەڵام لەگەڵ ئەواندا چەك هەڵنەگرێ کافرە.یان ئەو موقەللیدە نەزانانەی کە بۆ چەند مەسەلەیەکی فیقهی و عەقیدەیی دوژمنایەتیی (إبن تیمیە)یان دەکرد و چەند جارێك دەگیرا تا دوایی لە بەندیخانەدا وەفاتی کرد، یەکێکیش لەو مەسەلانە شتێك بوو کە بە هەموو عەقڵێك شایەنی ئەوە نییە هەرای لەسەر بکرێت ئەویش فەتوای ئبنو تەیمییەیە بۆ ئەو کەسەی سوێند بە تەڵاق بخوات تەڵاقی ناکەوێت بەڵکو تەنها کەفارەتی سوێندەکەی دەدات، دیاریشە هەراکە هی کەسانی نەزان و بێئیشە بە تایبەتی لەو سەردەمەی کە لادانی زۆری وا لە ئیسلامدا هەبوون کە شایەنی ئەوە بوون هەرایان لەسەر بکرێت نەك هەرا بۆ مەسەلەی خیلافی بکرێت.

کەواتە تەنها ئارەزووپەرستان و ئەوانەی بەرادەیەکی کەم یان زۆر لە ئیسلام لایان داوە وا تووشی دەمارگیری دەبوون و ئسلوبی تۆقاندنیان بەکار هێنابوو، لەبەر ئەوەپێویستە مرۆڤ وریای خۆیبێو لەسەر مەسەلە خیلافییەکان زۆرەملێ لە کەس نەکات. سنگ فراوانی بەردی بناغەی رەوشتی خیلافە و کەشوهەوایەکی پاك بۆ گەشەسەندنی علم دەسازێنێو گەرانەوەی سەردەمی زێرینی ژیارەی ئیسلامی نزیك دەخاتەوە ، هەروەها چیتر تواناکان نافەوتێن و بە شتی لاوەکی و بە دەمارگیری بۆ ئەم شتە لاوەکییانە ریزی موسڵمانان ناشێوێنرێت.

لە کۆتاییدا قسەی ئەو زانایانە دەهێنینەوە کە دەڵێن کەسێك نابێتە زانا تا شارەزای مەسەلە خیلافییەکان نەبێ.

لە راستیشدا یەکەمین پلەی قوتابی ئەوەیە شارەزای یەك مەزهەب یان بۆچوون بێ و ئەگەر لەم پلەیەدا بمێنێتەوە هەر بە قوتابێتی دەمێنێتەوە و ناگاتە پلەی زانایان. بە هەمان شێوەش و لە بواری کاری ئیسلامیدا دەمارگیری بۆ مەسەلەیەکی خیلافی مرۆڤ لە ریزی قوتابییەکاندا دەهێڵێتەوەو ئەگەر رەحم و بەزەییی خواشی لێ دوور بێ لەوانەیە هەروەها ببێتە قوتابییەك بۆ ئاژاوەو فیتنە.

## سەرچاوەکان


١. صحيح البخاري.
٢. صحيح مسلم.
٣. الدكتور طه جابر، أدب الأختلاف في الاسلام، الطبعة الرابعة ١٤١٣ – ١٩٩٢.
٤. الدكتور هاشم جميل عبدالله مسائل من الفقة المقارن،، القسم الاول، جامعة بغداد، ١٩٨٩.
٥. الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي، أسباب إختلاف الفقهاء في الأحكام الشرعية، رسالة دكتوراه بغداد، ١٣٩٦– ١٩٧٦.
٦. ظفر أحمد العثماني التهانوى، قواعد فى علوم الحديث، تحقيق و تعليق عبدالفتاح أبو غدة، بيروت – الطبعة الثالثة ١٣٩٢ – ١٩٧٢.
٧. حبيب الرحمان الأعظمى، الألباني شذوذه أخطاؤه، الجزء الثانى، الطبعة الأولى، الكويت ١٤٠٤ –١٩٨٤.
٨. حسن بن على السقاف، تناقضات الألبانى الواضحات، الجزء الأول و الثانى ١٤١٢ – ١٩٩٢.
٩. عبدالرحمن بن عبد الخالق، الرد الوجيز على الشيخ ربيع بن هادى المدخلى ١٤١٦ – ١٩٩٦.
١٠. أبن تيمية، رفع الملام عن الأئمة الأعلام، الطبعة الرابعة، بيروت ١٣٩٢.

١١. إبن تيمية إقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أصحاب الجحيم دارالفكر سنة؟

١٢. محمد على عجلان، مالايجوز الخلاف فيه بين المسلمين، جامعة الإيمان، صنعاء، ١٤١٥ – ١٩٩٥.

١٣. بن باز و العثيمين و عبدالله بن جبرين، اللجنة الدائمة، فتاوى اسلامية، الجزء الأول ، سنة ؟

١٤. الجداول الجامعة في العلوم النافعة، قسم العقيدة.

## ڕەشماڵ

# لەسەردەمی شارە مەزنەکاندا(★)

کێشەی دواکەوتوویی و بێ هێزی و پاشکۆیەتی کوردستان هی ئەمڕۆ نییە بەڵکو کێشەی بەردەوامی چوار پێنج هەزارساڵە، لە کاتێکشدا خەڵك دەوڵەت و شاری گەورەی خۆیان هەبوو خەڵکی کوردستان خاوەنی ڕەشماڵ بوون، ڕەشماڵی سیاسیی و عەسکەری و زانستی.

ئەم وڵاتە تەنانەت لە سەردەمی قەومە کۆنەکانیشدا(واتە بەرلە پەیدابوونی کورد) وای را کێشاوە کوردستان چوار یان پێنج هەزار ساڵە وەزعێتی، بەدەگمەنیش ئەگەر لەو یاسا کۆنە خۆی دەربازبکردایە.

ئەمە باسێکی قەومی نییە، فیکرەی قەومی خۆی هۆکارێکی‌سەرەکیی کێشەکەیە، ئەوساش لە جیاتی فیکرەی قەومی خێڵەکایەتی و ئیقلیمگەری هەبوو، ئەمڕۆش فیکرەی قەومی چۆتە جێگایان بەڵام کرۆکی مەسەلەکە وەکو خۆیەتی، فیکرەی قەومی خێڵەکایەتییە و فووی پیاکراوە، لەوەش خراپتر ئەوەیە کە خێڵەکایەتی یە ئەسڵی‌یە کە ئەمڕۆ زیندوو بووەتەوە،ئەم جارە لە بەرگی خێڵە سیاسی‌یەکاندا واتە حیزبەکان.

ڕووەکانی دواکەوتن کە لێرەدا باسیان دەکەین گەلانی تریش دەگرنەوە بەڵام وەکو قیر بەکوردستانەوە نووساون و وا دیارە یەخەی بەرنادەن.

وەکو تیشمان ئەمە باسێکی قەومی نی یە بەڵام ئەوە هەیە کە مرۆڤ کاتێك بیەوێ کار بکات لە هەوادا کار ناکات بەڵکو لەسەر زەوی، زەویش لە حاڵەتی ئێستاماندا کوردستانە.

ئیفلاسی بزوتنەوەی قەومی ئاشکرا بووە، ئیسلامیش وەك هیوا دەمێنێتەوە بەڵام بزوتنەوە ئیسلامی یەکان کێشەی خۆیان هەیە کە هەندێك لەو کێشانە وەکو هی بزوتنەوە قەومی یەکانە بۆ ئەوەش کە نەگبەتی یەکە بەردەوام نەبێ و کاری ئیسلامی یەکان نەبێتە لاپەڕەکەیەکی تری تۆ مارەکانی فەشەلی کوردستان ئەم باسە دەخەینە ڕوو ئەگەر کەس هەبێ گوێ بگرێ... لەوەش گرنگتر ئەگەر کەس هەبێ کاری پێ بکات.

با سەکەمان تەرکیز دەکاتە سەر ئامادەکردنی(عدة) واتە خۆ بە هێز کردن لەڕووی سیاسی و علمی و عەسکەری... و دروستکردی نەوعیەتێکی پلە یەك کە هەقی لاوازی ئابووری و بەشەری و تەکنەلۆجی..بکاتەوە. بابەتی تەقواو خواناسیش مەسەلەیەکی ترەو باسێکی تری پێویستە.

ڕەنگە بوترێ : موسڵمانانی سەردەمی پێغەمبەرایەتی و سەرەتای خیلافەت لە چاو دوژمنەکانیان دا بێ هێز بوون ، بەڵێ ڕاستە ئەوان لەڕووی ئابووری و بەشەری یەوە لاواز بوون بەڵام نەوعیەتەکەیان باشتر بوو، ئەمەش چەند بەڵگەیە کە :

عەرەب وا فێربوون بە شێوەی(کەڕو فەڕ) شەڕ بکەن واتە هێرش دەبەن و ئەگەر دوژمن خۆ ڕاگر بوایە دەگەڕانەوە دواوە و هێزەکانیان کۆ دەکردەوە و جارێکی تر هێرشیان دەبرد، بەڵام موسڵمانان لە یەکەم شەڕی گەورەدا(شەڕی بەدر) بەشێوەی ڕیز(الصف) یان نیزامی هێڵەکی(النظام الخطي) شەڕیان کرد ،واتە ریز ریز کە ئەمەش شێوەیەکی شەڕکردنی سوپا نیزامییەکان بوو، ڕاستە شێوەیەکی کۆن بوو، بەڵام پێشکەتوو تر بوو لە هی عەرەبەکان، ئالێرەدا کەمی چەك و چەکدار پڕ کرایەوە، بەڵگەیەکی ترئەوەیە کە عەرەب بەش بەش بوون بەڵام موسڵمانان یەك بوون و یەك سەرکردەیان هەبوو، عەرەب ژمارەیەك خێڵ بوون موسڵمانانیش دەوڵەتێك بوون وکە ئیدارەو(تنظیم)ی خۆیان هەبوو.

لەسەرەتای خیلافەتیشدا ئەم دەوڵەتە نوێ یە بەرامبەر دوو دەوڵەتی کۆنی فارس و ڕۆم وەستا کە لە ئیدارەو( تنظیم)دا کۆن و خاوەن خیبرە بوون بەڵام خۆ موسڵمانان ئەساسەکەیان هەر هەبوو، ئەو ئەساسەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دایمەزراند بوو.

با ئیتر نەختێك لەبارەی ڕووەکانی دواکەوتنمان بدوێین و بەزانست دەست پێ بکەین....

---

(★) گۆڤاری(ڕابەر) ژمارە(٣٥) ساڵی حەوتەم هاوین ١٩٩٨ز- ١٤١٩ ك، ل٢٠-٢٥.

**یەکەم : زانست**

ئەمە شتێکە وەك خۆر روون و دیارە دواکەوتنەکە لە کۆنەوە هەبوە و ئێستاش بەردەوامە ،جا ناکرێ هەموو لایەنێکی زانستی باس بکەین بۆ یە تەنها چەند نموونەیەك وەردەگرین :

ئەگەر باسی کۆن بکەین دەڵێین کەوا نووسین لەناو گەلانی کۆنی کوردستاندا زۆر کەم بووە، بەشێوەیەکی گشتیش پادشایانی کۆن فەرمانی نووسینی رووداوەکانیان دەدا بەلام کەمێك لە پادشایانی کوردستان(یاخود پادشایانی گەلانی کوردستان) ئەمەیان دەکرد ،کە دەشیان کرد زۆربەی شتەکان لاسایی کردن بوون، بەخەتی مێخی(مسماری) شتیان دەنووسی چونکە خەتی خۆیان نەبوو، بەزمانی ئەکە دی دەیان نووسی چونکە ببو بەزمانێکی جیهانی بۆ نووسین ،وێنەو کلێشەو قسەکانیش دیسان لاسایی کردن بوو، زۆر کەم ئەگەر بەزمانی خۆماڵی شت بنووسرایە، لەو رەشماڵە کۆنەدا ئیبداعت نەدەبینی.

دوایش لە کاتی فارس ورۆمدا حاڵ هەر وامایەوە، لەسەردەمی حوکمڕانی ئیسلامیشدا نووسین و خوێندنەوە بە رادەیەکی زۆر گەورەتر بلاوبووەوە بەلام هێشتا زۆر کەمتر بوو لەچاو ولاتانی تری موسڵمانان، قەد ناشتوانین کوردستان بەراورد بکەین لەگەڵ شارە گەورەکانی زانست وەکو نیسابورو بوخارا و مەرو و بەغدا.. چونکە جیاوازی‌یەکە وەکو نێوان زەوی و ئاسمانە.. باشە خۆ بەشێکی هەرە زۆری زاناکان عەرەب نەبوون،ئیتر بۆچی لێرەشدا جێ پەنجەی‌کوردستان لاواز بوو ؟

ئەوسا ولاتانی موسڵمان پڕی بوو لەزانا، ئێستاش دیارە زاناکان چەند کەمن وبەشی کوردستانیش هەمیشە و بەردەوام بەشە کەمەکەیە، با نەختێکیش باسی زانا و زانستی ئەوسابکەین.

ئەو کەسەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێ(حافظ)کابرایەکی کوێرە کە مەعیشەتی لە سەر قورئان خوێندنەوەیە و هەموو قورئانی لەبەرە بەلام(حافظ)ی زەمانی زوو ئەو کەسە بوو کە ناوو حاڵی زۆر لەو کەسانەی دەزانی کە فەرموودەیان ڕیوایەت کردبوو(کەدەیان هەزار کەس بوون) و هەزاران فەرموودەیان لە بەر بوو، هەشبوو لەوان بەتواناتر و(أمیر المؤمنین في الحدیث)ی پێ دەوترا وەك ئیمام احمد کە بەدەستی خۆی یەك ملیۆن فەرموودەی نوسیبوو و لەبەری بوو، کەسێکیش وەکو(ابو زرعة الرازي)(٦٠٠) هەزار فەرموودەی لەبەر بوو[1]. زاناکانیش لێهاتووبوون لەبابەتی خۆیاندا ئەوەتا(ابن کثیر) باسی(المزی) ی شێخی خۆی دەکات کە چۆن فەرموودەی بۆ دەخوێنرا ئەویش دەینووسی یەوە و جارو بار چاوی گەرم دەبووو خەو دەیبردەوە بەلام کاتێك ئەو کەسەی شتی دەخوێندەوە هەڵەی دەکرد بۆی ڕاست دەکردەوە.

زانا هەبووە هەزاران کتێبی دەخوێندو دەیان و سەدانی دەنووسی، هەر بۆ نموونەش دەڵێین کەوا تەنها یەك کتێبی(ابن کثیر) کە تەفسیری قورئانە دەکاتە نزیکی(٦٠) کتێبی(١٠٠) لاپەڕەیی، کتێبەکانی تریشی چوارو پێنج ئەوەندەن... کەچی ئێمە وامان لێهاتوە بەزەحمەتێکی زۆر وەوە و تاریك دەنووسین.

لەوەش خراپتر ئەوەیە کەسانێك هەن لە کوردستاندا لەجیاتی نووسین و وەرگێڕانی کتێب بایەخ بەشکڵ دەدەن هەموو زانست و هونەرەکەیان بلاو کردنەوەیی نووسینی کوردییە بە پیتی لاتینی بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کەوا رۆشنبیرییە شەق و شڕەکەی کوردستان بەم کارە دەیان ساڵ دەگەڕێتە دواوە چونکە ئەگەر هەوڵەکەیان سەر بگرێ ئەوا لەوکاتەدا پێویستە سەر لەنوێ خەڵکی فێری نووسین بکرێت، ئەمجارە بەلاتینی ئینجا پێویستە هەموو کتێبەکانی قوتابخانەکان لە چاپ بدرێنەوە ... هەر بەلاتینی ئینجا پێویستە چ کتێبێکی بە نرخ کە بە پیتی عەرەبی دەرچوو بوو لە چاپ بدرێنەوە.. دیسان بەلاتینی... بەم جۆرەش لەپێناوی شکڵێك دەیان ساڵ لە شوێنی خۆماندا بوەستین... لەڕاستیدا مەسەلە هەرشکڵ نی یە بەڵکو رقێکە لە پیتی عەرەبی چونکە بۆنی ئیسلامی پێوەیە هەروەها نەخشەیەکی رۆژئاوایە بۆ کۆیلەکردنی رۆشنبیری و دوایی تر بۆ دابڕاندنمان لە گەلانی تری موسڵمان.

کەسانی تریشمان هەیە لە جۆری تر... ئەمانەی تر کاتێك لەبارەی فیکرەیەکی رۆژئاوایی دەدوێن و زاراوە قەڵەوەکان دەجوونەوە دەیانبینی وەکو میزەڵدان هەوایان تێ دەچێت و هەست دەکەی دڵیان بە خۆیان خۆشە... بەلا م ئەم کەسانە نازانن کەوا ئەوەی کاوێژی دەکەن بنکڕی فیکری رۆژئاوایە و هی دەیان ساڵ لەمەوبەرەو تازە بەدەستیان دەگات. هەروەها نازانن کەوا ئەمەی دەیکەن بەڵگەی نابووتی و هەژاریی رۆشنبیری خۆیانەو چۆك دادانە بەرامبەر ژیاری رۆژئاوا... ئەگینا پێمان بڵێن کام کورد تیۆرێکی کۆمەڵناسی یان دەروون ناسی یان هەچ بوارێکی فیکری تری دامەزراندوە ؟ یان کام کورد شتێکی زیاد کردووە

بۆئەم فیکرانە یاخود وەك زانایانمان دەڵێن بۆتە(مجتهد في المذهب) ؟ تەماشای رەشماڵە بکە دەبینی چەندین نەفەر دەمیان دەجولێ و کاوێژ دەکەن.

باسی بایەخی زانستیش لە کوردستاندا بکەین ئەوا شتێکی شاراوە دەرناخەین ئەگەر بڵێین کەوا زانست بایەخی نی یە و لایەنی ماددی پێوانەی ژمارە یەکە.. لە ئەمەشدا کورد لەگەڵ هەموو وولاتانی دنیادا یەك دەگرێتەوە بەلاّم رەنگە تەنها لە کوردستان لە بەر مەبەستی حیزبی مامۆستای زانکۆ ئەوەندە بێ رێز بێ کاتێك دەستگیر دەکرێ دەخرێتە ناو سندووقی سەیارەو ببرێ بۆ بارەگا.

لەلاییەکی تریشەوە رێکخراوەکانی دەرەوە قورەکەمان بۆ خەست دەکەنەوە و لە جیاتی بلاّوکردنەوەی رۆشنبیری مەڵبەندی بەتاڵی و کات بردنە سەر دەکەنەوە و لە جیاتی بلاّو کردنەوەی کتێبی بە سوود ئەو(ئنجیل)ەی کە خۆیان کاری پێناکەن بلاّو دەکەنەوە تا فێرمان بکەن کە خۆمان کاری پێ بکەین و سبەینێ ئەگەر زللەیەکیان لێ داین لە سەر رووومەتی راستمان رووومەتی چەپیان بۆ وەر چەرخێنن... ئینجا دەوڵەتە گەورەکانیش دەبینین کە بە چەك و فێڵ بڕیارەکانیان لەڕێ ی( U N)ەوە ئامادەیە بۆ سەر کوت کردنی هەموو ترو سکایەکی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆجی کە لە هەر وولاّتێك دەر بکەوێ.. بەڵێ ! خۆمان حاڵمان زۆر جوان بوو بەبێ ئەوان وا ئەمڕۆ ئەوانیشمان بۆزیاد بوو.

جا لەکۆتایی دا با ئەوەش بڵێین کەوا لەناو ئێمەی ئیسلامیدا کەسانێك هەن نەختێك زانستی شەرعیان دەست کەوتووە و دڵیان پێ ی خۆشە ئێمەش دەڵێین : سەرێك لەو رەشماڵە دەربکەن و بزانە چۆن لەسەر لێواری دەریاکەن... علمـەکان زۆر فراونن و ئێمەش هێشتا لەسەرەتادایین و لە رەشماڵی(تەقلید)دەرنەچووین.

لێرەدا و بۆ چارەسەر کردن روو دەکەینە کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکان بە تەنیا و دەڵێین کەوا دوو لایەن هەیە بۆ چارەسەر کردنی کێشەی زانستی و رۆشنبیری :

١. لەلایەن کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکان :دەبێ هانی ئەندامان بدەن بۆ جێبەجێ کردنی لێکۆڵینەوە بۆ نموونە ژمارەیەك کەس بە لایەنی فیکرە رۆژئاوایی‌یەکان تەرخان بکەن هەریەکێکیان بۆ فیکرەیەکی دیاری کراو، کۆمەڵێکی تر خەریکی لێکۆڵینەوە لە بارەی وولاّتە گرنگەکان، کۆمەڵێك بۆ زانستە شەرعی‌یەکان... هتد. ئەم لێکۆڵینەوانەش ئەگەر بلاّویشنەکرێنەوە دەتوانرێ لە ئاستی کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکە بلاّوبکرێنەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاری ئەندامانی.

٢. لایەنی تاکە کەسەکان : دەبێ هەر فەردێك بۆ خۆی هەوڵ بدات زانیاری خۆی زیاد بکات و ئەوە بخاتە مێشکی خۆی کەلە بوایێکدا شارەزایی پەیدا بکات.

## دووەم : سیاسەت و ئیدارە

ئاشکرایە کە سیاسەتی کوردستانی ئەمڕۆ سیاسەتی پاشکۆیەتی‌یە، کۆنیش هەروا بووە، لە بەشی زۆری مێژووی کوردستاندا خەڵکی کوردستان پاشکۆی دەوڵەتەکان بوون، ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەنی ئیدارە و سوپای نیزامی بوون بەلاّم خەڵکی کوردستان عەشائیری لێیان دەخورێ ئەنجامیش شکستە جۆراوجۆرەکان بوون، سەیریشە چۆن لە هەموو بارێکدا کوردستان شکستی هێناوە ئەگەر پاشکۆ بووبێت فەشەلی کردووە و ئەگەر دژی پاشکۆیەتی شەڕی کرد بێ هەر فەشەلی هێناوە بەجۆرێك دەتوانین مێژووی کوردستان بە مێژووی فەشەل و شکست هێنان ناو بنێین، هۆکەش بەڕای ئێمە نەبوونی سیاسەت و ئیدارە و سوپای نیزامی بوو، هەروەها پەرتەوازەیی و یەك نەبوون.

با لاپەڕەکانی مێژوو هەڵ بدەینەوە.. زیاتر لە چوار هەزار ساڵ بەر لە ئێستا گوتی‌یەکان لە کوردستانەوە بەسەر ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا دابارین و داگیریان کرد بەلاّم بزانە پاشاکانیان چەند حوکمیان دەکرد، یەکێك ساڵێك یەکێکی تر دوان، یەکێکی تر سێ ساڵ، لە هەموویان زیاتر یەکێك بوو پانزە ساڵ حوکمی کرد دوایی کوڕی خۆی هات وتەنها چل رۆژ حوکمی کردو سومەرییەکان توانیان دەریان بکەن، ئەم ماوە کەمانەی حوکم کردن نیشانەی پشێویی‌یە، دوای چوار سەد ساڵیش کابرایەك نامەیەك بۆ برادەری خۆی دەنووسێت(کە فەرمان ڕەوای ناوچەی رانیە و پیاوی ئاشوورییەکان بوو)و دەڵێ : پادشا زۆرەکانی لوللوم(=لوللو) کە بوونەتە دوژمنت(٣)....هتد، دوای هەزار ساڵیش و هەر لەو ناوچەیەدا پادشایەکی ئاشووری باسی ئەو گەلە دەکات کە چۆن هەموو پادشاکانیان یەکیان گرت و(بڕوایان کرد بە لەشکرە گەورەکەیان)[٤]، بەلاّم ئەنجام شکستی ئەو پادشایانە و وێران بوونی وولاّتەکەیان و داگیرکردنی و پادشاکانیش ناچار بوون خۆیان تەسلیمی پادشای ئاشووربکەن.

لە باکووریشدا لە ناوچەی دەوروبەری دەریاچەی(وان)دا(٢٣)پادشای وولاتی نائیری لە سالی(١١١٣) پێش زاینی دژی پادشای ئاشوور شەڕیان کرد[٥](بڕوانە یەك پادشای ئاشوور و ژمارەیەکی زۆری پادشایانی بەشێکی کوردستان) پێش ئەوەش بە(١٥٠)سالْ پادشایەکی تر دەلێ کەوا بەسەر چل پادشای ئەو ولاتە سەرکەوت[٦].

ئینجا ئەمارەتە زۆرەکانی کوردستان و شەڕی نێوانیان و شۆڕشە زۆرە سەرنەکەوتووەکانی کورد : ئەوانەن(شێخ عبیدالله)و(شێخ سەعیدی پیران)و(سید رضا)و(قازی محمد) تا دەگەینە(١٩٧٥)و هەرەسێکی کتوپڕی بە هۆی یەك بڕیارەوە پاشان تێکشکانی حیزبە کوردیەکان سالی(١٩٨٨)... وا ئێستاش خەلْکی کوردستانی عێراق چاوەڕێی هەرەسێکی ترن.

وەك ووتمان هۆکان ئەمانەن : نەبوونی سیاسەت و ئیدارە و سوپایەکی نیزامی و پەرتەوازەیی و یەك نەبوونی... واش دەزانین کەوا هۆکارە سەرەکەیەکە هۆکاری جوگرافییە... کوردستانیش وەك ولاتێکی شاخاوی جیایی نێوان بەشەکانی دروست بووە و هەر ناوچەیەك بووەتە ولاتێك بۆ خۆی، لەوەشەوە هەستی ئیقلیم گەری پەیدا بووە و زۆر زەحمەتیش بووە ئەم هەموو ناوچە شاخاوییانە بخرێنە ژێر یەك دەسەلات، ئەمڕۆش هەر وای لێ هاتووە.. دوو ئەمارەت لە یەك بەشی کوردستاندا دروست بوون، ئیتر نازانین ئەگەر شاخەکانی کوردستان نەبوونایە کورد دەفەوتا یان دەبووە وولاتێکی یەکگرتوو؟

باسی پەرتەوازەییمان کرد.. جا لە وولاتێکی پەرتەوازەدا پێویست بە نیزام و ئیدارەی نیزامی ناکات بەلْکو بەسە مرۆڤەکان عەشائیریانە لێی بخوڕن، هەروەها لەشکری عەشایەری بەسە و پێویست بە لەشکری نیزامی کات، دەولەتی (ماد)یش نمونەی دەگمەنە ئەویش زۆری نەخایاند.

ئەمڕۆ ڕۆژی دەولەتی یەککگرتووی مەرکەزییە، کاری ڕۆژئاواش لە کوردستاندا ئاسانە، ڕۆژئاوا دەیەوێت وولاتان بکاتە وورده وولات و پارچەی زۆریان لێ دروست بکات و لە هەمان کاتدا دەولەتی گەورەی خۆی دابمەزرێنێ، کوردستانیش کە فێری یەك دەولەت نەبوو کاری ڕۆژئاوا ئاسان دەکات.

بە کورتی : جوگرافیای کوردستان وەکو خۆیەتی و کاری خۆی دەکات لە پەرتەوازە کردنی پارچەکان مەگەر تەکنەلۆجیا و کردنەوەی ڕێگاوبان... هتد، نەختێك لەم شتە کەم بکاتەوە، پەرتەوازەیییەکە هەیە، هەلە کۆنەکان بەسەر کەوتوویی دووبارە دەکرێنەوە، پاشکۆیەتی هەیە و بازاڕی گەرمە بۆ کڕیار و فرۆشیار، دەسەلاتدارانیش حەز ناکەن وابێ چونکە کەس حەز ناکات ئاغای هەبێت بەلام ناتوانن وانەکەن لەبەر ئەوەی بە دەست ئەوان نییە، لەوەش خراپتر گێلێتیی سیاسی لە ناو کوردا بلاو دەکەنەوە کاتێك کە دەبنە دەهۆلێکی ڕۆژئاوا و ڕاستییەکان لە خەلکی دەشێوێنن.

## سێیەم : لایەنی عەسکەری

لە ناو جیهانی لەشکرە قەبەکاندا کوردستان چی بۆ کراوە ؟ کورد قەت حەزی لە(ضبط)و(نظام)نەبووە لەوەش دەچێ گەلانی پێش کوردیش هەروا بووبن، کاری ئەمڕۆش دروست کردنی لەشکرێکە کە خوشویستنی(ضبط و نظام) لە ناو دلی ئەندامانی دا بچێنی و پاشان ئەم خۆشویستنە نەقل بکرێ بۆ هەموو خەلکەکە.

ئالێرەدا خوێندنەوەی مێژوو سوودێکی گەورەی هەیە، لە شکری ئاشووری توانی چەندین دەولەت و گەل تێك بشکێنێ. لە شکرێکی نیزامیی مەشق پێکراوی خاوەن(ضبط و ربط)بوو، لە شکری ڕۆمایش هەر بەم جۆرە بوو، بڕوانە کەلەشکری قرطاجە(کارتاگ) لە باکوری ئەفریقیا توانی لە چەند شەڕێکدا بەسەر ڕۆمادا سەربەکەوێ و تەنانەت خاکی ئیتالیا داگیر بکات(ڕۆما) نەبێ، ئەمانەش هەموو بەلێهاتووی سەرکردەکەی واتە(هانیبال)بەلام چونکە بازرگانەکان قرتاجەیان حوکم دەکرد و لەشکرەکەی لەشکری بەکرێگیراو(مرتزقە)بوو وولاتەکە لە کۆتاییدا بەرامبەر ڕۆما بەزی و داویی تر لە ناو برا، لەشکری ڕۆماش بریتیبوو لە خەلکی وولاتەکە کە خزمەتیدەکرد، لەشکری دەزگا(مؤسسة) بوو نەك تاکە کەس.

لە مێژووی نوێشدا دەزگای عەسکەری لەشکری ئەلمانی دروست کرد. خەلك وادەزانێ کە ئەلمانییەکان لە سروشتی خۆیان مرۆڤی عەسکەرین[٧] بەلام لە ڕاستیدا نموونە هەن کە بەر لە سەد سال لە ئەمریکادا ئەوانەی کە بەرەچەلەك ئەلمانی بوون، نموونەی سەربازی خراپ و پەڕپووت بوون[٨]، ئەلمانییەکانی هیچ شتێکی جیاوازیان نەبوو لە گەلانیتر بەلام بە هۆی چاك خوازە عەسکەریەکانی وەك شارنهۆرست(١٧٥٥ – ١٨١٣) و گنایزناو(١٧٦٠ – ١٨٣١) و ئەفسەری تر و پاش شکستی پروسیا(کە گەورەترین ئەمارەتی ئەلمانی بوو پێش یەکبوون)بەرامبەر ناپلیۆن... توانرا بناغەی سوپایەکی بەهێز دابمەزرێنرێ و دەستەی ئەرکانی گشتی(هيئة الأركان العامة)توانی باشترین سوپا دروست بکات[٩].

عەقید(دوپوی)ش دەڵێ کەوا ئەم کەسانە(بە تایبەتی یەکەمیان)هەوڵیان دا کە لێهاتوویی و سەرکەوتوویی عەسکەری بخەنە چوار چێوەی دەزگایەك... سەرکەوتنی پروسیا و دوایی تریش سەرکەوتنی ئەڵمانیای یەککرتوو بەرهەمی دەزگا عەسکەرییەکە بوو، لە ڕاستیشدا دوو شکستی ئەڵمانیا لە دوو جەنگی گەورەی جیهان لە ڕوویەکەوە نیوە سەرکەوتن بوون چونکە لە یەکەمیاندا ئەڵمانیا لە مەیدانی شەڕدا شکستی نەهێنا بەڵکو بەهۆی پیلانی جوولەکەو کۆمۆنیستەکان بوو،لە دووەمیشیاندا ئەڵمانیا دژی هەموو جیهان شەڕی کرد.

نموونەیەکی سەرکەوتوویی سوپای ئەڵمانی ئەوەیە کەکەفائەتی سەربازە ئەڵمانییەکان ساڵی ١٩٤٣ -١٩٤٤(٢٠٪ – ٣٠٪) لە هی بەریتانی و ئەمریکییەکان زیاتر بوو واتە(١٠٠) سەربازی ئەڵمانی بەرامبەر(١٢٠ – ١٣٠) بەریتانی و ئەمریکی بوون(ئەمەش بەمەرجێك ئەڵمانەکان لە ١٩٤٤ دا شکستیان هێنا) بەرامبەر بریندار بوون یان کوژرانی دوو ئەڵمانی سێ سەربازی ئەوان هەبوو، ئەمەش لە هەموو حاڵەتەکاندا، لە کاتی هێرشی ئەڵمانەکان و لە کاتی دیفاع کردنیان لەو کاتەی ژمارەیان زۆرتر بوون و لەو کاتەی دوژمنەکان زۆرتربوون... لەو کاتەی لە ئاسماندا زاڵ بوون و لە و کاتەی وانەبوون، لەو کاتەی سەرکەوتوو بوون و لەو کاتەی ژێر کەوتووبوون[10].

بەرهەمی(إنضباط)ی ئەڵمانیش ئەوەیە کەلە کاتی دۆڕاندنیان لەشکرەکەیان نەڕووخاو(إنضباط)ەکەیان هەر مابوو هەتا لەو کاتەش کە خۆیان بە دەستەوە دەدا[11].

کە فائەتی سەربازە ئەڵمانەکان لەو کاتەوە کە چاکسازی دەستی پێکرد هەر لە بەرزبوونەوەدا بوو، ئەوە بوو بەر لە چاکسازییەکان ناپلیۆن پروسیای داگیر کرد، بەڵام پاش حەفتا ساڵ پروسیا فەرەنسای داگیر کرد و لە پاریسدا ئەڵمانیای یەککرتوو ڕاگەیانرا.

لە ڕاستدا بەشی گەورەی ئازایەتی و لێهاتوویی لە شەڕدا بریتییە لە(خۆڕاگرتن)جا هەر لەم بارەیەوە نموونەی گالی یەکان(فەرەنسایییە کۆنەکان) هەیە کەگەلێکی ئازا بوون، بەڵام زۆربەی کات بەرامبەر لەشکری(ڕۆما)دا دەشکان چونکە ڕۆماییەکان خۆڕاگر بوون و هەندێك جار لەشەڕدا سەرکردەکانیان دەکوژران بەڵام ئەوان نەك هەر خۆڕاگر دەبوون بەڵکو سەریش دەکەوتن، ئەمە لە کاتێك دا گالییەکان تەنها بەدڵ گەرمییەوە شەڕییان دەکرد و کاتێك شەڕەکەیان درێژەی دەخایاند سارد دەبوونەوەو دەشکان، هۆیەکی ئەمە و خۆڕاگری ڕۆماییەکمانیش بەڕای ئێمە(ضبط و نظام)ی سوپای ڕۆمایە.

کوردیش و ئەو گەلانەی پێش کوردیش لە کوردستاندا هەبوون شەرکەری ئازا بوون بەڵام خێرێکی وایان لەم ئازایەتییە نەدیبوو چونکە ئازایەتی فەردی بوو، لە کاتێکدا سوپا پێویستی بە شتێکە لەمە زیاتر، ڕەنگە نەبوونی(ضبط و نظام) لە ناو کورددا هۆی ئەو هەستە خراپەمان بێ کاتێك وێنەیچەکداری کورد لە ڕۆژنامەکانی دەرەوەدا دەبینین دەڵێین : ئەگەر خۆمان کورد نەبووینایە دەمانووت : تەماشاکە چەند دواکەوتوو و درندەن.... بە کورتی ئەوەی کە وێنەی چەکداری کورد دەبینی(إنطباع)ێکی باشی بۆ دروست نابێ... لەو بڕوایەشداین کەوا ئەو(ضبط و نظام)ە ئەگەر لە ناو کورددا بچێنرێ ئەوا دەبێتە گەلێکی عەسکەری پلە یەك... بەڵام دەبێ کێ بەمە هەستێ ؟

لە کۆتاییشدا دەڵێین : بە عەسکەری کردنی کورد پێویستییەکی گەورەیە بۆ ڕەواندنی میراتی چوار یان پێنج هەزار ساڵ بۆ زاڵ بوون بەسەر جوگرافیای کوردستان کەبۆتە هۆی پەیدا بوونی هەستی خێڵەکایەتی و واقیعی پەرتەوازەیی و ژیانی دوور لە(نظام).

با ئاوڕیش نەدەین لەو کەسانەی کە بە قسەی هەندێك ڕۆژئاوایی هەڵخەڵەتاون و فەلسەفیانە و خەیاڵیانە بیرکردنەوەو ڕەخنە لە عەسکەریەت دەگرن چونکە ئەمانە حەزیان لە ژیانێکی شل و نەرمە و ئەگەر شوێنی خەیاڵەکەیان بکەوین کە دەڵێن :(جیهانێکی بێ چەك و بێ شەڕ و پڕ لە ئاشتیمان دەوێ) ئەو کاتە خۆمان بەرەو تیاچوون و مل کەچی دەبەین. پێشیان دەڵێین : دەوڵەتە گەورەکان ئەم جۆرە بانگەوازانە بڵاو دەکەنەوە ئێوەش دەیجوونەوە، بەڵام ئەو دەوڵەتانە هەر خۆیانن کە خۆیان پڕ چەك دەکەن، عەسکەریەت هەر دەمێنێ بتانەوێ یان نەتانەوێ بەڵام ئەو کاتە و بەپێی فەلسەفە و خەیاڵەکانی ئێوە عەسکەریەتێکی دواکەوتوومان دەبێ.

با ئەو ڕاستییە بزانین کەوا مەرج نییە درندێتی بەرهەمی عەسکەریەت بێ چونکە ئەگەر تەقالیدی عەسکەری ڕەچاو بکرێن کاری پیاوەتی و سوار چاکی(فروسیە)دێتە کایەوە.

نموونەش هەیە لەسەر ئەوە یەکێك لەوانە ئەوەیە کەلە کاتی شەڕدا دژی ناپلیۆن(ولنگتۆن)ی بەریتانی رازی نەبوو تۆپ بگرێتە ناپلیۆن هەر چەندە نزیك بوو لێی و دەیتوانی ئەمە بکات چونکە بە ڕاستی نەدەزانی کە جەنراڵەکان تاقە لە یەکتر بکەن[12]. هەروەها جەنراڵ لاتور ماربۆرگی فەرەنسی لە ئیسپانیادا(ساڵی ١٨١١) و پاش ئاگر بەست (هدنە)نامەیەکی نارد بۆ فەرماندەی تۆپخانەی بەریتانی(کە بەر لە نەختێك لە حاڵەتی شەڕدا بوو لەگەڵیدا)و ستایشی دەکرد بۆ لێهاتوویی[13]. لە ساڵی(١٩١٤)شدا ئەفسەرێکی بەریتانی دەمە تەقێی کردبوو لەگەڵ پزیشکێکی ئەڵمانی کە بەدیل گیرابوو.

ئەم جۆرە رەفتارانە دوایی بە هەوادا چوون و لە ساڵی(١٩٤١) دا ئەفسەرێکی بەریتانی سەرزەنشت کرا چونکە جەنەڕاڵێکی ئەڵمانی دیلی دەعوەتی خواردن کردبوو پێش ئەوەی بخرێتە بەندیخانەی دیلەکان[14].

ئەمانە و نموونەی زۆری تر بەرهەمی تەقالیدی عەسکەری کە ڕێز لە کاری عەسکەری دەگرن لە کاتێکدا سیاسییەکان زۆر جار بایەخیان بەم مەسەلەیە نەداوەو زۆر جار بڕیاری وایان دەردەکرد کە لە چالاکییە عەسکەرییەکان دڕندەتر بوون. لە کاتێکیشدا ئەفسەرەکان بایەخیان دەدایە شەرەفی عەسکەری و شتی لەم بابەتە سیاسییەکان زۆر بە ئاشکرایی پەیمانی خۆیانیان دەشکاند.

## کۆتایی

زۆر ماوە بیڵێن چونکە ڕووەکانی دواکەوتن زۆرن بەڵام تەنها ئەوە دەڵێین : نەهێشتنی میراتی چوار یان پێنج هەزار ساڵ پێویستی بە شۆڕشە، کەسیش لەم وەزعەی ئێستادا چاوەڕێی شتێکی باش ناکات، بەڵام هیوایەك بە بزووتنەوەی ئیسلامییەکان هەیە، ئەوانیش دەبێت سوود لەم دەرسانە وەربگرن و دەست بەکاربن.

## پەراوێزو سەرچاوە


١. إبن رجب الحنبلي، شرح علل الترمذي، تحقيق و تعليق السيد صبحي جاسم الحميد، بغداد، ١٣٩٦ هـ، ص ١٨٢ و ١٩٢.

٢. إبن كثير، الباعث الحثيث... تعليق أحمد شاكر، ص ١١٥ – ١١٦.

3. J. Laessoe,The Shemshara Tablets....Copenhagen, 1959,p. 84.

4. A.K.Grayson، Assyrian Royal Inscriptions,2, 1976,p. 128.

5. D. D. Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia ,1, 1926, S241.

6. A.K. Grayson, Assyrian... 1,1972,S714.

٧. بڕوانە : العقيد ت. ن. دوپوی، عباقرة الحرب، الجيش و الاركان العامة في المانيا ١٨٠٧ – ١٩٤٥، ترجمة حسن حسن، الطبعة الثانية ١٩٨٤، ص ١٤.

٨. هەمان سەرچاوە، ل١٩ – ٢٠.

٩. بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە هەروەها : بسام العسلي، فون مولتكە،س بيروت، ١٩٨١، ل٣٦. بەدواوە.

١٠. عباقرة الحرب ل٩ + ٣٦٠، هەروەها خشتەکانی کۆتایی کتێبەکە.

١١. شيلفورد بيدويل، الحرب الحديثة، ترجمة المقدم مصطفى درويش، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت ١٩٨٥، ص ١٤٦.

١٢. هەمان سەرچاوە. ل ٣٩.

١٣. هەمان سەرچاوە. ل ٤١.

١٤. هەمان سەرچاوە. ل ٦٤

# عەلمانیەتی نامۆ

## کاری ئاین لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگە*

قسەیەکی زۆر بیستراوە کەوا عەلمانیەت لە ڕۆژهەڵاتدا نامۆیە، دوورە لە ئاین و بیروباوەڕو مێژوو و تەقالیدی ڕۆژهەڵات... ئەمە ڕاستە بەڵام لەوە ڕاستتر و لەوە زیاتر ئەوەیە کە عەلمانیەت لە مێژوو نامۆیە، لە مرۆڤ دوورە، عەلمانیەت تەنانەت لە خودی خۆشی نامۆیە.

لای عەلمانیەت جێگەی ئایین پەراوێزەکانە بەڵام ڕاستی شتێکی ترە : ئاین کاری هەبووەو هەر دەیمێنێت .ئایین شتێکی ئەساسیە لە پێك هاتنی مرۆڤ.

لەم باسەشماندا و هەچەندە دەمانەوێت ئەم ڕاستیە بسەلمێنین بەڵام خۆ مان لە دوو هەڵە دوور دەخەینەوە :

یەکەم:- نامانەوێت بڵێین کەوا ئایین هۆی هەموو ڕووداوێکە یان بنیاتنەری هەموو قۆناغێکی مێژوویی یە یان بزوێنەری هەموو سەردەمێکە. ئەگەر شتی وا بڵێین هەمان هەڵەی ڕۆژ ئاواییەکان دووبارە دەکەینەوە کەلەناو گێژاوی گومڕایی یەکاندا هەموو شتەکانیان دەگەڕاندەوە بۆ یەك بنەما : ئابووری، ئەخلاقی، جنسی،...هتد. ئەمڕۆ بۆ ئەوان ئاشکرا بووە ئەم بۆ چوونە چەند سادەو زێدە ڕۆیە.

دووەم :- هەروەها ناشمانەوێت بڵێین کەوا ئایین کاردەکاتە سەر دەوڵەت و کۆمەڵگە بەبیٚ ئەوەی ئەمان کاری تیٚ بکەن.

قسەیەکی هەڵەیە تەنها بڵێین ئایین دەوڵەتی دروست کرد یان بڵێین ئایین کۆمەڵگەی پێك هێنا یان سیفەتە تایبەتەکانی پیٚ بە خشی، ئەمە ڕاستە بەڵام هەروەها ڕاستیشە کەوا کۆمەڵگە خۆی سەدان و هەزار ئایینی زەمینی هێنایە بوون، بەمەی زانیبێت یان نا. کۆمەڵگە بەسەر کەوتوویی سەدان ئایینی دەستکاری کردووە و شتی بۆ زیاد کردوون، شتی لیٚ کەم کردوون، ڕەوتەکەی گۆڕیون. دیسان دەوڵەتیش هەوڵی تاك تاکی خۆی داوە بۆ دروست کردنی ئایین و هەوڵی زیاتری داوە برەو بە فلانە ئایین بدات ئیتر ئەگەر لەم هەوڵەی دا سەر کەوتوو بوو بێت یان ژێر کەوتوو..

پاش خۆپاراستنیش لەم دوو هەڵەیە دەپرسین : کەواتە چی بۆ ئایین دەمێنێتەوە ؟ جێگەی ئاین لە کۆمەڵگەو لای دەوڵەت چی یە ؟ با خراپترین حاڵەت وەربگرین : با بڵێین کەوا کۆمەڵگە یاخود دەوڵەت داهێنەری هەموو ئایینێکن.. لێرەدا دەوری ئایین بەزەقی دیارە، ئەگەر ئایین گرنگ نەبێت، ئەگەر ئایین دەوری نەبێت ،ئایین سەر هەڵنادات و دروست ناکرێت. حاڵەتێکی دیکە وەردەگرین، دەوڵەت دەست دەخاتە کارو باری ئایین. دیسان ئەمە بەڵگەیە لە سەردەوری ئایین... یان حاڵەتی پشت گویٚ خستنی هەموو ئاینێك کە ئەمە نیشانەی بوونی ئایینێکی ترە، واتە ئاینێکی عەلمانی کە ئەو ئایینانەی پشت گویٚ خستوە.

بەم شێوەیە بەرکەنار کردنی ئایین خۆ گێل کردنە لە سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگە، ئایین هەبووەو هەر دەمینێت، کاری خۆی هەبووەو لە دەستی نادات، ئیتر ئەگەر ئەو ئایینە ئایینێکە بە پیٚ ی پێناسەی باوو ڕەسمی یان ئایینییێکی عەلمانی بێت..

ئەنجامی دوایەمین ئەوەیە عەلمانیەت نامۆیە لە سروشتی مرۆڤ، لە کۆمەڵگە، لە حوکم، لە مێژوو. دەمێنێتەوە بزانین چۆن عەلمانیەت نامۆیە لە خودی خۆی.

### عەلمانیەت لە هەر ئایینەدا وەکو بیٚ لایەن خۆی پیشان دەدات

عەلمانیەت بیٚ لایەنە بە رامبەر ئایینەکان و وەکو یەك تەماشایان دەکات.. ئەمە چی دەگەیەنێت ؟ ئەنجامێك دەگەیەنێت کە عەلمانیەکان لیٚ ی بیٚ ئاگان. عەلمانیەت بەم جۆرە خۆی دەخاتە ((سەرووی ئایینەکان))، عەلمانیەت بەم جۆرە بیرو باوەڕێکی تایبەتە کە بەرنامەی تایبەتی خۆی هەیە.. واتە ئایینێکە بەڵام ئایینێکە لە سەرووی ئایینەکانەوە.. لەوان بەرزترو گەورەترە.

---

* گۆڤاری ڕابەر، ژمارە ٣٦، ساڵی حەوتەم، پایزی ١٩٩٨، ل٢٧-٣٢.

ئالێرەدا ڕەخنە دەست پێ دەکات : چۆن عەلمانەییەت بەئایین دەزانرێت ؟ کوا مەلاو قەشەو مزگەوت و کەنیسەکانی ؟ کوا ئەو (دۆگما) یانەی کە قابیلی گۆڕین و لابردن نین؟

ڕەخنەیەکی سادەیەو بێ ئاگایە لە مێژوو، تەنانەت لە جەوهەری عەلمانیەتیش تێ نەگەیشتووە.

ئێمە نالێین بەڵکو مێژوو و زانستی (ناسینی ئایین) دەڵێت کە ئایینی وا هەبووەو هەیە خاوەن پەرستگا نی یە، بۆنموونە (تۆتەمیەت) پەرستگای نی یە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو ئایینانە زۆرن کەمەلاو قەشەو کاهینیان نی یە. ئەو (دۆگما) یانەش کە قابیلی گۆڕین نین ئەو بنەمایانەن کە سەرجەم عەلمانیەت لە سەریاندا ڕاوەستاوە.

عەلمانیەت ئەگەر ڕێگا بدات بە نەمان یان دەستکاری کردنی ئەو بنەمایانە چیتر وەکو عەلمانیەت نامێنێتەوە و پێویستە ناوێکی تری لێ بنرێت.. ئەمە عەلمانیەت بەگشتی، لە خوار ئەویشەوە ئایینە عەلمانییە جۆرا جۆرەکان هەن کە هەر یەکێکیان ژمارەیەك (دۆگما)ی هەیە. سۆشیالیزم هەیەتی، باڵی مارکسیی سۆشیالیزم هەیەتی، دیموکراسی هەیەتی.... تاد.

دۆگمایی عەلمانیەت هەر لەسەرەتاوە هەیە. ئەم سەرەتایەش پێناسەی عەلمانیەتە. پێناسەکە ئەوەیە کە ئایین و دەوڵەت لە یەکتر جیا بکرێنەوە، ئایین دەست نەخاتە کاروباری دەوڵەت و دەوڵەت دەست نەخاتە کاروباری ئایین.. جائایا ئەگەر ئەم پێناسەیە لابەرین و بیکەینە شتێکی تر بیرو باوەڕێکی ترمان دەست ناکەوێت ؟ کەواتە دەبێت پێناسەکە بمێنێتەوە.. ئەمەیە دۆگماو ئەمەیە ئایین.

مێژوو ناس و بیرکەرەوەی بەریتانی (تۆینبی) باس لە پەرستنی عەلمانییەکان دەکات. لەو پەرستنانەش کەناویان دەبات : پەرستانی حوکمی پادشانشینی دەستووری کەلە ئنگلتەرادا ئەم حوکمە سەری هەڵدا[1]، یان بە خواوەند زانینی (دایکی پەرلەمانەکان)واتە پەرلەمانی ئینگلیزی کە هەموو گەلان ویستیان لاسایی بکەنەوە[2]، یان پەرستنی دەوڵەتی خاوەن سەروەری[3].

جگە لەمانەش پەرستنی عەقڵ و گۆڕینی کەنیسەی نۆتردام بۆ پەرستگای عەقڵ ڕووداوێکی دەرکەوتووی شۆڕشی فەڕەنسی ئەگەر چیش ماوەیەکی زۆر کورتی خایاند (١٧٩٣-١٧٩٤).. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئایینە عەلمانیەکان خۆیان لەوە زیاترو بەرزتر دەزانن کە ناوی ئایین لە خۆیان بنێن.

(بودۆن) و (بوریکۆ) ش لە فەرهەنگەکەیاندا باس لە ئایینە دنیایەکان دەکەن کە لەگەڵ پەیدا بوونی حزبەکان لە سەدەی بیستداو پەیدا بوونی دەوڵەتە تۆتالیتارییەکان (ئەوانەی دەست دەگرن بەسەر سەر جەم چالاکیەکانی کۆمەڵگەدا) پەیدا بوون[4]. ئەم ئایینە بەناوی زانستەوە یان ڕاستتر ئەوەیە بەناوی زانستی دروێینەوە ئەو شێوازانەی ئەرثودۆکسیەت و مل کەچ بوونیان زیندوو کردەوە کەلەچاو شێوازەکانی دیکە مل کەچی یەکی زیاتریان تێدایە[5].ئەو ئایینانە چەند ئایدیۆلۆجیایەکیان ئامادە کرد، هەروەها چەند تەفسیرێك کە تا ڕادەیەك گۆترەن و پاشان ئەمانەیان بە پیرۆز زانی[6]، ئەمانە بریتین لە ستالینیەت و نازیەت،بەڵام بەپاڵ ئەمانە دوو نووسەرەکە باس لە (ئایینی دنیایی نامەرکەزی) دەکەن کە چەند نموونەیەکیان لە ئەمریکا دا هەیە وەك بزوتنەوە کۆمەڵایەتی یەکان : ئەو بزوتنەوانەی بۆ دیفاع کردن لە کەمایەتی یەکان سەریان هەڵدا، یان دژی جەنگی ڤێتنام، دژی ووزەی ئەتۆمی، ئەوانەی ئافرەتان، ئەوانەی نێربازان[7]... ئێمەش دەتوانین سەدان نموونەی تر لە ووڵاتی خۆمان و لە جیهاندا بدۆزینەوە.

بۆ سەلماندنی ئەوەی عەلمانیەت ئایینە مەبەستەکەمان دوور کەوتەوە لێمان. مەبەستەکەمان ئەوە بوو بیسەلمێنین کە عەلمانیەت تەنانەت لە خودی خۆشی نامۆیە، بەڵام سەلماندنی ئایینێتی عەلمانییەت ئەم ئەنجامەمان دەداتە دەست : عەلمانیەت خۆی وەکو بێ لایەن بەرامبەر بە ئایینەکان پیشان دەدات، بەڵام خۆی ئاینە، خۆی یەکێکە لە ئاینەکان، ئاینێك لە سەرووی هەموو ئاینەکانە، دەبوایە بیوتایە : من ئاینێکی بێ لایەنم بەرامبەر هەموو ئایینەکانی دیکە... واتە لە خۆ پێناسە کردندا ووشەی (دیکە)ی لە یاد چووە... ڕاستتریش ئەوەیە بڵێین لە یادی نەچووە بەڵکو نەیزانیوە کە دەبێت ئەم ووشەیە بەکار بهێنێت. لەم خاڵەشەوە ئیزدواجی کەسایەتیی عەلمانیەت دەست پێ دەکات.

عەلمانیەت بەم پێیە دوو کەسایەتیی هەیە، کەسایەتییەکی وەهمیی ئعلان کراو و کەسایەتییەکی ڕاستەقینەی شاردراو. بەڵام چونکە ئەم کەسایەتی یە دووەمە کەسایەتی یەکی نەدۆزرایەوە، عەلمانیەت خۆی پێ ی نازانێت... هەبوونی ئەم ئیزدواجە نەك تەنها ناڕێکی یە بەڵکو هەروەها لەت بوونی خودە بە جۆرێك کەسایەتی یە ئعلان کراوەکە وەکو نامۆیەك بەرامبەر کەسایەتی یە ڕاستەقینەکە دەوەستێت، عەلمانیەت ئەمە نازانێت...

ناڕێکییەکە لەوەدا نی یە کە عەلمانییەت دووشتی دژ بەیەکی کۆکردۆتەوە (ا)و (ب) و هەریەکێکیان لە شوێنێکەوە هێنا بێت، ئەگەر وابێت عەلمانییەت قابیلی چارەسەرە بەوەی (ا) یان (ب)لابەرێت، بەڵکو ناڕێکییەکە لەوە خراپترە. عەلمانیەت دەڵێت (ا) بەلام ئەم (ا)ە بۆخۆی (ب)ی دژ بە خۆی دروست دەکات. هەبوونی ناڕێکی لەناو عەلمانیەتدا ئەنجامێکی حەتمیەو چارەسەری نی یە.

کاتێکیش عەلمانییەت دەچێتە مەیدانی کارکردن نامۆییەکەی قووڵتر دەکاتەوە. عەلمانییەت لە هەموو شوێنێکدا کەم تا زۆر دەست دەخاتە کاروباری ئایین.. عەلمانییەت بەم دەست تێوەردانە نیوەی پێناسەی خۆی لەدەست دەدات، لەیادمان نەچێت پێناسە ئیعلان کراوەکەی.

(تۆینبی) مل کەچ کردنی ئایین بۆ سیاسەت بەتاوان دەزانێت، تاوانێك کە باپیرانیان لەسەدەی (١٦)و(١٧)ی زایینی بەرپایان کردبوو[8] و دەڵێت ئەو کەنیسانەی مل کەچی دەوڵەت نەبوون گەورەترین چالاکی یان هەبوو، بەلام (تۆینبی) ئیسلام بە (استثناء) ناو دەبات[9]، واتە ملکەچبوونی ئاین بۆ سیاسەت لە ئیسلامدا زیانی بە ئیسلام نەگەیاند هەرچەندە پێویست دەکات باس لە مل کەچ بوونی سیاسەت بۆ شەرع بکەین نەك بە پێچەوانەوە.

هەڵەی پێناسەی عەلمانییەت لەوەدایە کە ئایین و دەوڵەت وەکو دووشت دەبینێت کە دەکرێت دژ بەیەك بن. بەڵێ ئەم دووانە دووشتی جیاوازن، بەلام بەبێ ئەوەی بتوانین بە دژی یەکتریان بزانین. ئەمە وەکو ئەوەیە بڵێین (کاغەزی سپی) ، تۆ ناتوانیت (کاغەز) لە (سپێتی) جیا بکەیتەوە تەنانەت فەلسەفەی نەزۆکیش توانای ئەمەی نییە، تۆ ناشتوانیت (کاغەز) بە دژی (سپێتی) بزانیت چونکە دوو((شت))ی قابیلی بەراورد کردن نین.

کەواتە پێناسەیەکی باشتری عەلمانیەت دەبێت جیا کردنی (پیاوی سیاسەت) لە (پیاوی ئاین) بێت... پیاوی ئاین نابێت دەست بخاتە کارەکانی پیاوی سیاسەت، بەلام تەنانەت ئەمەش چارەسەری کێشەکە ناکات، با تەماشای حاڵەتەکان بکەین :

١. حاڵەتی یەکەم: پیاوی ئاین هەر خۆی پیاوی سیاسەتە، ئەمە حوکمی (ثیوکراتی)یە واتە حوکمی کاهنەکان بە واتای ڕاست و دروستی زاراوەی (ثیوکراتی).

٢. پیاوی ئاین دوور خراوە لە کاری سیاسی بەلام پیاوی سیاسەت هەمان ئاینەکەی پیاوی ئاین بەسەر کۆمەڵگەدا دەچەسپێنێت، لێرەدا پیاوی سیاسەت لە هەمان کاتدا پیاوی ئاینە، حوکمەکەش حوکمێکی ئایینی‌یە بە واتا بڵاوو بازاڕییەکەی زاراوەی حوکمی ئاینی.

٣. پیاوی سیاسەت ئاین لە ژیانی تایبەتی خۆیدا دەچەسپێنێت بەلام دووری دەخاتەوە لە حوکم کردنی کۆمەڵدا و ڕێبازێکی تر لە حوکمدا بەکار دەهێنێت. ئەم پیاوی سیاسەتە دوو ئاینی هەیە، ئەوەی ژیانی تایبەتی خۆی و ئەوەی کەلە کۆمەڵگەدا دەیچەسپێنێت.

٤. پیاوی سیاسەت بانگەشە بۆ عەلمانیەت دەکات و دەیچەسپێنێت، ئەم پیاوە خاوەن ئاینێکی عەلمانی‌یە و لە هەمان کاتدا پیاوی ئاینە... بێگومان ئاینی عەلمانی.

ئەمە هەندێك حاڵەت بوو، ویستیشمان یارمەتی عەلمانیەت بدەین بەوەی پێناسەیەکی گونجاوتری بۆ هەڵبژێرین بەلام هێشتا لە بازنەی ئاین ڕزگارمان نەبووە ئەمەش جگە لەو ناڕێکیەی کە حاڵەتی عەلمانی سێیەم و چوارەمی سەرەوە ئاشکرایان کرد.

حاڵەتی چوارەم حاڵەتێکی نوێیە و نازانین چەندی تر دەژی، بەلام بە دڵنیایی‌یەوە و وەك دوایی باسی دەکەین زۆر ناخایەنێت، حاڵەتی سێیەمیش زۆرتر ڕوویداوە بەلام ڕەنگە قەت بە پوختی ڕووی نەدابێت چونکە هەمیشە حاڵەت هەبووە پیاوی سیاسی خۆی نەگرتووە یان زۆری لێکراوە ئاین بخاتە مەیدانی سیاسی یان بەلای کەمەوە ئاین بۆ سیاسەت بەکار بهێنێت[10].

تا ئێستا لە پێشەکی باسەکەماندا بووین، پێشەکی‌یەکەش لەبەر ئەهەمیەتی درێژەی خایاند و سێیەکی باسەکەمانی برد، با ئێستاش کورتی بکەینەوە :

عەلمانیەت نامۆیە لە مرۆڤایەتی، لە مێژوو، عەلمانیەت نامۆیە لە خۆشی، باسەکەشمان لەبارەی دەوری ئاینە لەسەر کۆمەڵگە و دەوڵەت ئەگەر ئەو دەورەی سلبی بێت یان ئیجابی : ئاین ڕەگی لە هەست و عەقڵی مرۆڤایەتیدا داکوتیوە ئیتر ئەگەر ئەو ئاینە ئاسمانی بێت یان زەمینی.ئینجا با تەنها دوو ڕووی کاری ئایینی لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگە باس بکەین : دامەزراندن و پێکهاتەکانی دەوڵەت، لەگەڵ کاری ئاین لەسەر پێشکەوتن.

## ئاین و دەوڵەت

هێنانەوەی نموونە لەسەر کاری ئاین لەسەر دەوڵەت واتای ئەوەیە بەشێکی مێژووی مرۆڤایەتی بخەینە سەر کاغەز، هەمووشمان ئیسلام وەکو باشترین نموونە دەناسین کە چۆن بە هۆی ئیسلامەوە کۆمەڵە خێڵێکی دواکەوتووی عەرەبی دژ بە یەك دەوڵەتێکی جیهانییان پێك هێنا و چۆن هەر ئیسلام خۆی بوو رێگەی دا غەیری عەرەب لە ئەییوبی و مەمالیك و عوسمانی... هتد.حوکم بکەن، ئەمە باش زانراوە بۆیە نموونەیەکی تر دەهێنینەوە.

### ئاگردان هەرەس بە نیزامی پادشایی دەهێنێت

فۆستیل دو کولانج لە کتێبە ناودارەکەیدا (شاری کۆن) — کە ساڵی ١٨٦٤ بڵاو کرایەوە — باس لە ئاین و نیزامی دەوڵەتەکانی یۆنانی کۆن و رۆما دەکات. (دو کولانج)دەڵێت کە ئاینی کۆن خێزان و ژن هێنان و دەسەڵاتی باوك و پلەکانی خزمایەتی و ماڤ موڵکداری و میراتیی دروست کرد، پاشان شاری دامەزراند و لە ئاینەوە هەموو نیزامەکانی کۆمەڵگەو دەوڵەت هاتبوون[١١].

ئەو ئاینە ئاینی (ئاگردان) و (مردوو پەرستن)ە، (دوکولانج)باسی ولاتی یۆنانی کۆن و رۆما دەکات بەڵام جاروبار نموونە لە ئارییەکانی هندستانی کۆنیش دەهێنێتەوە. رێز لە ئاگرو پەرستنی ئەو ئاگرە وحورمەت زانینی پێشینانی مردوو و پەرستنیان لای نووسەر ئاینی کۆنی گەلانی ئارییە.

لەناو ماڵە یۆنانیورۆمانییەکاندا ئاگردانێك هەبوو.ئاگرەکە پیرۆزەودەبێت خواردن و خواردنەوەی پێشکەش بکرێت ،نابێت گوناه لەبەر دەمیدا بکرێت، نابێت ئاگرەکە بکوژێتەوە، رێزگرتن لەو ئاگرە رێز گرتن بوو لە پێشینە مردووەکەی ماڵەکە، رەنگە هەر لەژێر ئەم ئاگردانەدا گۆری پێشینێك هەبوو بێت. خێزانەکە پێکەوە دەژین،لە نزیك خانووەکەش لەیەك گۆری بە کۆمەڵدا دەنێژرێن . کەسێکیش جیا بێتەوەو ماڵی خۆی هەبێت ئاگردانی خۆی دەبێت و ئاگری داگیرسێنەری یەکەم لە ئاگردانی ماڵی باوکییەوە وەردەگرێت. پەرستنێکیوا رێگە بە کۆچەری نادات، دەبێت ئاگردان و گۆڕەکان جێگیر بن، کۆچەریش کە هەبێت دامەزراندنی دەوڵەت زەحمەتە. ئەم ئاینە دەسەڵاتی باوکی بە هێز کرد، خێزانی پتەو کرد، نیزامی موڵکداری و میراتیی دامەزراندا. خێزانەکان گەورەتربوون، هەر ژمارەیەکی خێزان کۆمەڵێکی گەورەتریان دروست کرد – *Phratrie* یۆنانی و *Curie* بەلاتینی– هەر ژمارەیەکیش لەمانە خێڵێ`کیان پێك هێنا ، لە خێڵەکانیش شار دروست بوو[١٢]، هەر کۆمەڵێکیش لەمانە پەرستنی هاوبەشی هەبوو، خێڵەکان چینی ئەشرافیان پێك هێنا لە کاتێکداو لای (دوکولانج) عەوامەکان بریتی بوون لە زۆڵەکان وئەوانەی لە خێزان دەرچوو بوون لەبە هەر هۆیەك بێت، هەروەها کۆچ کردووەکان..... تاد. ئەشرافەکان دەیان ووت کەوا عەوامەکان نە ئایینیان هەیەو نە ئاگردان. سەرەتا پادشا هەبوون بەڵام چینی ئەرستۆکراتی ئەوەندە بە هێز بوون کە پادشا کە بریتی بوو لە پادشایەك لەناو کۆمەڵێك پادشای تر. ناکۆکی نێوان هەر دوو لادا رووی دا و لە هەموو شوێنێکدا شۆرش بەرپا بوو و یان حوکمی پادشایی نەما و حوکمی کۆماری هاتە جێگەی وەکو رۆما یان پادشاکان مانەوە بەڵام بە هەڵبژادن دادەنران. شۆرشی ترو گۆڕانکاری تریش روویان دا کە باس کردنیان لێرەدا بابەتەکەمان دوورو درێژتر دەکات.

ئارییەکانی هندستان ئاگری پیرۆزیان دەپەرست، دوایی ئایینی (براهما) ئایینی ئاگردانی کردە ئایینی پلە دوو بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانێت لە ناوی بەرێت[١٣]. وەك (دیورانت)یش دەڵێت : ئاگر (=خوداوەند ئاگنی$AGNI$)ماوەیەك گرنگترین خواوەندی کتێبە پیرۆزەکانی (ڤیدا) بوو کە ئەمیان نێوان ١٠٠٠–٥٠٠ پێش زایین سەریان هەڵدا بوو[١٤]. ئەو ئارییانەی کە دەوروبەری ١٦٠٠ پێش زایین پەلاماری باکوری رۆژئاوای هندستانیان دا نیزامی حوکمی پادشاییان هەبوو بەڵام بەپاڵ پادشا ئەنجوومەنێکی جەنگاوەران هەبوو کە سنووری دادەنا بۆ دەسەلا تی ئەو پادشایە[١٥]. دوایی بێ گومان حوکمەکە بەرەو حوکمێکی پادشایی رەها (مطلق) چوو.

لە نەخشەکەی سەرەوەدا کارێکی گران نییە بیسەلمێنین ئایینی ئاگردان و مردوو پەرستان کۆنترین ئایین نەبووە و کەنەخشەکە تەنها یۆنانی کۆن و رۆمای دەگرتەوەو تەنانەت بۆ ئەوانیش نەخشەکەی (دو کولانج) زێدرەویی تێدایە بەڵام شتێکی زەحمەتەنەخشەکە سەرتاپا برمێنین و لەوە زەحمەت تر ئەوەیە هەستە عەلمانییە مردوەکان بەسەر سیحری ئەو نەخشەیە و سەرجەم باسەکانی (دوکولانج)دا سەر بکەون.

## ئایین و پێشكەوتن .. نموونەیەكی ئیجابی

یەكێك لەو قسانەی لە عەقڵی نیوە رۆشنبیردا چەسپیوە ئەوەیە كە دەڵێن:ئایین هۆی دوا كەوتنە.. بەم شێوەیەو بیّ وورد بوونەوە و بیّ لێكۆڵینەوە حوكمی سادەی ئامادەكراو دەخرێتە بازاڕی رۆشنبیری و بیّ نەوایی زانستی زیاتر و گەورەتر دەبێت.

ئێمە ئەم جارەش هەروا نموونە لە سەر ئیسلام ناهێنینەوە، دەبێت كیّ بیّ ئاگا بێت لە بەرهەمەكانی ژیاری ئیسلامی ؟ نموونەی ئێمە شتێكی ترە.

بەر لەوەش دەڵێین كەوا ئایین دەوری هەیە لە گۆڕینی كۆمەڵگە، لە زۆر حاڵەتیشدا

(گۆڕین) هەنگاوی یەكەمی پێشكەوتنە.(تۆینبی) سیّ هۆكاری جیا كردوەتەوە بۆ گۆڕانی كۆمەڵگەی كۆن بۆ كۆمەڵگەیەكی نویّ كە گرنگترینیان بریتی یە لە هەبوو ئایینێكی جیهانی[١٦].

باسیش لە ئارییەكان و (حیثی)یەكان [١٧] و ئاخییەكان دەكات، كە بەتەواوی نەزان بوون بەڵام دەستیان بە پەرستنەكانیانەوە گرتبوو، ئەم گەلانە پەلاماری وولاتە پێشكەوتوەكانی سەردەمی خۆیانیان دا و توانیان شارستانی نویّ پێك بهێنن، شارستانی هندی، حیثي، هیلینی (یۆنانی)[١٨]. نموونەكەمان لە سەر دەوری ئیجابیی ئاین نموونەیەكە زۆر باسكراوە ئەویش دەوری پرۆتستانتیەت لە سەرهەڵدانی گیانی سەرمایەداری.

(ماكس ڤێبەر)ی كۆمەڵناسی ئەڵمانی (١٨٦٤ – ١٩٢٠) لە كتێبە ناودارەكەیدا (ئەخلاقی پرۆتستانتیەت و گیانی سەرمایە داری) باس لە چەند كۆمەڵێكی پرۆتستانتی دەكات كە چۆن بەربەستیان دادەنا لەبەردەم مەسرەف كردن و چۆن ئەم مەسرەف نەكردنە سەرمایەی لای ئەو كەسانە كۆدەكردەوە. وەنەبێت مەسەلە تەنها كۆكردنەوەی سەرمایە بووبێت چونكە سەرمایەداری لە وولاتانی چین و هندستان و بابل، بەڵكو لە دێرزەمانەوە هەبووە پاشان لە سەدە ناوەڕاستەكاندا هەبووە بەڵام هەموو ئەمانە ئەو ئەخلاقە تایبەتیەیان نەبوو كە (گیانی سەرمایەداری)ببزوێنن[١٩].

ئەو گیانی سەرمایەدارییە هۆكاری گەشەندنی سەرمایەداری بوو[٢٠]، ئەو چەند كۆمەڵە پرۆتستانتە ئەو ئەخلاقەیان هەبووە بەڵام ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت كە دامەزرێنەرانی ئەو كۆمەڵانە ئەو ئامانجەیان لە مێشك دا هەبوو، بەڵكو ئەمە ئەنجامێكی چاوەڕوان نەكراو بوو، بەڵكو بەزۆری ئەنجامێك بوو كە خۆیان نەیان دەویست[٢١].

لەبارەی ئەو ئەخلاقەی كە سەرمایەداریی دروست كرد (ڤێبەر) چەند بڕگەیەكی دوور و درێژی ئامۆژگارییەكەی زانا و سیاسەت مەداری ئەمەریكی (بنجامین فرانكلین)لە سەدەی نوزدەدا دەهێنێتەوە كە ئێمە ئەمەی لیّ هەڵدەبژێرین :

(دەنگی چەكوشەكەت سەعات پێنجی بەیانی یان هەشتی ئێوارە خاوەن قەرزەكە وا لیّ دەكات كاتێك دەیبیستێت مۆڵەتی شەش مانگی دیكەت بداتیّ بۆ دانەوەی قەرزەكەت... بەڵام ئەگەر لەو كاتەی كە دەبێت كار بكەیت تۆی بینی بلیارد بكەیت یان گوێی لە دەنگت بوو لە چایخانەدا.... ئەو كاتە بۆ سبەینیّ داوای قەرزەكەی دەكاتەوە (....) ئەمە (واتا كار كردنی بەردەوامت) هەروەها دەیسەلمێنێت كەوا قەرزەكانت لەیادە، ئەو كاتەش وەكو مرۆڤێكی وردكار و بەڕەوشت دەردەخات و ئەمە (رصید)ت لای خاوەن قەرزەكە زیاد دەكات...) [٢٢].

ئامۆژگارییەكەی (فرانكلین) مەبەستی سوودو قازانج وەرگرتنە زیاتر لە هەر مەبەستێكی تر[٢٣]. بەڵام ئامانجەكەی ئاشكرایە : كۆششی بەردەوام، دڵسۆزی، جدیەت، راستگۆیی... ئێمەش دەڵێین ئاین دەتوانێت ئەمانەدروست بكات و دەتوانێت پێچەوانەی ئەمانە بچێنێت. ئەم تایبەتیانە لە دوو شتدا كۆدەبنەوە : دڵسۆزی و جدیەت، هەر ئەم دوانەش بوون بەڕادەیەكی سەرەكی ژاپۆنی سەدەی نوزدەیان گۆڕی لە دەوڵەتێكی دەرەبەگەوە بۆ دەوڵەتێكی پیشەسازی هەر ئەوانیش بوون پاش جەنگی دووەمی جیهانی ژاپۆن و ئەڵمانیای وێران بوو یان هەڵسانەوە سەرپیّ...

بە بیّ ئەوەش كە نەخشەكەی ڤێبەر لە سەددا سەد وەكو خۆی وەربگرین(واتە پرۆتستانتیەت بە تەنها ئەم كارەی پیّ كراوە وهیچ باوەڕێكی تر ئەمەی پیّ ناكرێت) دەڵێین كەوا ئیسلام هاندەری ئەو دوو رەوشتەی سەرەوەیە بەڵام دەبێت ئیسلامی پوخت بێت، ئیسلامێك لە سەرانسەری ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتیدا ببینرێت نەك ئەو ئیسلامەی كەلە خەیاڵی ئەو كەسانەدایە كەزاراوەی (ئیسلامی سیاسی) بەكار دەهێنن، ئەو ئیسلامەی كە جێگەی شیاوی لای ئەوان سووچێكی مزكەوتە ئەگەر ئەمەشی پیّ رەوا بزانرێن.

با جارێکی تریش بڕگەکانی ئامۆژگارییەکەی (فرانکلین) بخوێنینەوە و لە خۆمان بپرسین : کام ڕەوشت لای ئێمە باوە ؟ با نموونەیەکی زۆر سادە بخەینە ڕوو، بچۆ بۆناو بازاڕی خۆمان، تەماشای فرۆشیارەکانمان بکەو بزانە چۆن هونەر و زانست و ئیبداعیان لەوە کۆبووتەوە کە چۆن بتوانن لە تەرازوودا سەد گرامت لێ بدزن، یان چۆن شتەکان بە جوانی ڕیز دەکەن، شتی باش لەپێشەوە و شتی گەنیو لە دواوە. کە ئەمانەشت بینی لەوە دڵنیابە کە ئەم فرۆشیارانە سەرجەم نیزامی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەخلاقیمان و کورت دەکەنەوە... ئەو فرۆشیارانە نموونەی ئێمەن.

## ئاین و پێشکەوتن : نموونەیەکی سلبی

(تۆتەمیەت) نموونە سلبیەکەمانە، (تۆتەمیەت) – کە بابەبتی سەدان و هەزاران لێکۆڵینەوەی ئەنثرۆپۆلۆجیایە – لە ناو گەلانی زۆر سەرەتاییدا (یان وەك دەوترێت : دواکەوتوو)لە ئەمەریکای باکوورو باشوور و ئەفەریقا و ئاسیا و ئوستراڵیادا... هەبووە و تا ئێستا ماوە.

(تۆتەم)(Totem) ئاژەڵێکی تایبەتە بە تیرەیەك و لای ئەندامانی ئەو تیرەیە پیرۆزە و نابێت بکوژرێت، تەنها لای هەندێك تیرە و لە بۆنەی تایبەتیدا دەخورێت، حاڵەتی هەندێك تیرەش هەیە کەتۆتەمی خۆیان بە حەرام نازانن[٢٤].

تیرەکە ئاژەڵەکە بە پێشینی خۆیان دەزانن یان کاتی خۆی ئەو پێشینە پەیوەندی ژن خواستنی بەستبوو لەگەڵ ئەو ئاژەڵە. تۆتەم تەنها ئاژەڵ نییە بەڵکو تۆتەمی ڕووەکیش هەیە. هەندێك تیرەش تۆتەمی تۆتەمی شتی بێ گیانیان هەیە نموونەی سەیریش لەسەر ئەمە : گوێزانی مووتاشین، یان پارەی مەعدەنی[٢٥] بەڵکو لەوەش سەیرتر : لۆری، یان ئامێری چاپ[٢٦]. بە هەر حاڵ ئەمە نموونەی دەگمەنەو تۆتەمی ئاژەڵ بڵاوترە.

لێرەدا ناکرێت باس لە سەرجەم نیزامی تۆتەمی بکەین و مەبەستیشمان ئەمە نییە. مەبەستەکەمان لەم باسەدا تەنها یەك شتە : پەیوەست لە نێوان تۆتەمیەت و دواکەوتنی شارستانیەتیدا چییە ؟ مەبەستەکەمان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەیە کەلە ڕاستیدا یەك پرسیارن : بۆچی هەمیشە تۆتەمیەت لە ناو گەل و خێڵە (دواکەوتووەکان)دا هەیە ؟ چۆن تەفسیری ئەم قسەیە بکەین کەتۆتەمیەت لە ناو شارستانیە گەورەکانی ئەوروپاو ئاسیادا نییە (کە بەمە دەوترێت بۆشایی تۆتەمی)[٢٧] ؟ ئایا تۆتەمیەت هۆی دوا کەوتنی شارستانییە یان بە پێچەوانەوە دواکەوتنی شارستانی تۆتەمیەتی هێنایە ژیان یان هیچ لەم دووانە نییە و پەیوەندی نیە لە نێوان تۆتەمیەت و دوا کەوتنی شارستانی ؟

بینیمان چۆن لە یۆنانی کۆن و ڕۆمادا هەر خێزانێك خواوەندێك و پەرستاگایەکی خۆی هەبووە.ئەمە نیشانەی پەرتەوازەییە بەڵام ئەو ووڵاتانە هەنگاوی تریان بڕی : خواوەندی هاوبەشی کۆمەڵە خێزانێك، خواوەندی هاوبەشی خێڵەکە، خواوەندی هاوبەشی شارەکە، ئەمەش جگە لە چەند خواوەندێکی ((گەردوونی)).

بەڵام تۆتەمیەت ڕێگە بۆ پەرتەوازەیی خۆش دەکات، تەنها هەندێك حاڵەتی تۆتەمی هاوبەشی نێوان چەند تیرەیەك هەیە، بەڵام بە گشتی هەر تیرەیەك تۆتەمەکەی جیا دەکاتەوە لە تیرەکانی تر، بەڵکو هەندێك حاڵەتیش هەیە کە تیرەکە چەند تۆتەمێکی هەیە، زەحمەتیشە کە تیرەیەك تۆتەمەکەی داڵە لەگەڵ تیرەیەك کە تۆتەمەکەی گورگە لە ژێر پەرستنی تۆتەمێکی هاوبەش ( بابڵێن ئاسکە کێوی) یەك بگرن. حاڵەتە دەگمەنەکانیش حسابیان بۆ ناکرێت.ئەمە لە کاتێك دا شتێکی ئاساییە ئەگەر چەند خێزانێکی ڕۆمایی کە هەریەکێکیان پێشینێکی جیاواز دەپەرستێت لەژێر پەرستنێکی هاوبەش یەك بگرن... مرۆڤ لە مرۆڤەوە دەبێت، پێشین لە پێشین، بەڵام بۆ تۆتەمیەت پێوویستە بازێکی گەورە بدرێت تا بڕوا بەیەك گرتنی تۆتەمەکان بکرێت، حاڵەتی دەگمەنیش ئەگەر هەبێت بەڵگەیە لەسەر گەورەیی بازەکە.

ئەم پەرتەوازییەی کە تۆتەمیەت دەیهێنێتە ژیان تیرەکان بێ هێز دەکات، شتێکی زانراویشە کە دەوڵەت بە کۆ بوونەوی داهاتی زۆر پێك دێت، ئەمەش پێویستی بە کۆکردنەوەی تیرەکانە لە خێڵێکی گەورەدا و کۆکردنەوەی خێڵەکانە لە یەکێتیەکی گەورەتردا، بەڵام کۆکردنەوەی تیرە تۆتەمییەکان لەیەکێتییەکدا کارێکی زەحمەتە.هەر لە بەرئەوەشە دەوڵەت لەناو ئەو تیرانە دا نابینرێت، ئەوەی هەیە جۆرە ڕێکخستنێکی سیاسیی ساکارە. تەنانەت هەندێك کۆمەڵگەی وا سەرۆکی نییە وەکو (نوێر *Nuer* لە باشووری سودان)[٢٨]، هەیشە پێشەوایان هەن و خەڵکەکە دان بە سەرکردایەتییەکەیان دەنێن بەڵام ئەم پێشەوایانە هێز ناسەپێنن (وەکو بۆشمەن و بیرگداما لە باشووری ئەفریقادا)[٢٩]، بەڵکو خێڵی وا هەن هیچ ڕێکخستنێکیان نییەو هەر کەسێك ئازادیی تەواوی هەیە لەم شوێن بۆ ئەو شوێن بڕوات وەکو(هادزا لە ئەفەریقادا)[٣٠].

بەشێوەیەکی گشتیش ئەو کۆمەڵانە حوکمێکی جەماعییان هەیە (جەماعی لە چاو حوکمی فەردی)؛ بەپاڵ پێشەواکە ئەنجوومەنێکی جەنگاوەران یان ئەنجوومەنێکی پیران هەیە لە ئەفەریقادا پێویستە پێشەوا پێش بڕیاردان پرس بکات [٣١]. لەناو هیندییەکانی ئەمەریکاش وەك ( کلاستەر) دەڵێت شوێنەی راستەقینەکەی دەسەڵات بریتییە لە کۆمەڵگە نەك پێشەوا [٣٢].

لە نیزامێکی واشدا پێشکەوتن زەحمەتە .پێشکەوتن بە شایەتیی مێژوو لەگەڵ سەر هەڵدانی پێشەوایەکی دەسەڵاتداردا کەوتە جووڵە، لەگەڵ دروستبوونی ئیمپراتۆریەتیشدا پێشکەوتن خێراتربوو.بەلای کەمەوە پێشکەوتن بەرهەمی یەکبوونە.

بێگومان هۆی تر هەن بۆ دواکەوتن لە کۆمەڵگەی ئایین تۆتەمی و غەیری تۆتەمی، کاری ئایینیش لەم نموونە سلبییەدا هەر ئەوە نەبوو بەتەنها باسمان کرد، بەلاٚم ئەوەندە بەسە بۆ ناسینی کاری ئایین بە سلبی یان بە ئیجابی.

هۆیەکی تری دواکەوتنی ئەو کۆمەڵگانە دیاردەی (تشدد)ە، زۆربوونی شتە حەرامەکان دیاردەیەکە لە زۆر لەو کۆمەڵگەیانەدا بینراوە. حەرامەکان تەنیا کوشتنی تۆتەمەکە یان خواردنی ناگرنەوە بەڵکو لە هەندێك کۆمەڵگەدا(بۆ نموونە) هەروەها ناوبردنی تۆتەمەکە یان هەرناوێکی نزیك لەو. جۆرێکی تری (تشدد)لە حەرامدا ناوبردنی مرۆڤە مردووەکەیە، یان ((گلاوبوونی)) بێوەژن یان بیٚ باوکەکان پاش مردنی پیاوەکە[٣٣]. (تشدد) هۆیەکی سەرکییە بۆ وەستانی کۆمەڵگە گەن کردنی.

(تشدد) روویەکی سیاسیی هەیە ئەویش بەوەی کە پێشەوا ئیلتزاماتی قورسی هەیە، وەکو پێشەوایانی (مائوری) لە (نیوزیلاند) کە گوایە رەوتی جیهان لە باران و خۆر. تاد ،کۆنترۆڵ دەکەن بەلاٚم پێویستە بە ئیلتزاماتی خۆیان هەڵبسن و ئەو (پێشەوایەی ئەمڕۆ وەکو خواوەندێك دەپەرسترێت رەنگە سبەینێ وەکو تاوانبار بکوژرێت)[٣٤] ئەم کەلەبچەکردنەش هەروا لە(ئایەرلندا)ی کۆن و لە پلەی کاهنی گەورەی رۆمادا هەبوە [٣٥]، بۆیە لەزۆر شوێندا خەڵکی خۆیان لە لێپرسراوێتی وا دەدزییەوە و کۆمەڵگە بەزۆر دەیسەپاند بەسەر کەسێکدا [٣٦]، دیارە لە کەش هەوای سیاسیی واشدا دەبێت کۆمەڵگە وەکو خۆی بمێنێتەوە و رووەو گۆڕان نەچێت... یەکێکیش لەئەنجامەکانی گۆڕان پێشکەوتنی شارستانییە وەك چۆن ئەم پێشکەوتنە بۆ خۆی گۆڕانی تر دەهێنێتە بەرهەم.

## دوارۆژی عەلمانییەت

عەلمانیەت (یان ڕاستتر : ئایینی عەلمانی) پێشبینی دەکرد کە ئایینەکان نامێنن، بەلاٚ م وەك (بودۆن) و (بوریکۆ) دەڵێن ئەم نەمانە زۆر بەکەم و کورتی هاتۆتەدی [٣٧]، یەکێك لە بەدیلەکانی ئایین بریتی بوو لە فلسەفە بەلاٚم فەلسەفە —وەك تۆینبی بەرەوانی بۆی چوو بوو – بە پێچەوانەی ئایین ئەو هێزو حەیەویەتەی نیە وفەلسەفە هەر کاتێك دەچێتە مونافەسە لەگەڵ ئاییندا دەدۆڕێت.[٣٨].

بە کورتی ئایین بە دیلی نییە، هەر کاتێکیش هەر شتێك خۆی وەکو بەدیلی ئایین پیشان بدات جگە لەوەی سەرکەوتنی هەمیشەیی بە دەست ناهێنێت، هەروەها ئەو راستیەی لیٚ بزر دەبێت کە خۆی ئایینە بەلاٚم دەیەوێت جێگەی ئایینێکی دیکە، ئایینێکی رەسمی بگرێتەوە.

لە سەدەی نۆزدەدا (ماکس شتێرنەر)ی فەوزەویی مولحید ووتبوی کەوا هەر شۆڕشێك دژی خودا شۆڕشێکی لاهووتییە.

راستە ! هەر شۆڕشێك دژ بە ئایینیش شۆڕشێکی ئایینیە، لەم روانگەیەوە عەلمانیەت وەك ئایینێك نەك هەر دوا ڕۆژی نییە، بەلاٚم (ئێستا) و (ئەم ساتە کورتە)شی لە دەست داوە، خواستی عەلمانییەت بەرکەنار بوونی ئایینە، بەلاٚم وەك ووتمان پێویستە مەسەلەکە بەم شێوەیە دابڕێژین : خواستی ئایینی عەلمانییەت بە کەنار کردنی ئایینەکانی ترە، کەواتە بەپیٚ ی پێناسەی تەواوی ئایین عەلمانییەت لە هیچ ساتێك دا وجوودی نی یە.

ئەمڕۆ لە عەلمانیترین ولاٚت ئایینە رەسمییەکە وجودی خۆی دەسەلمێنێت، فەرەنسا بۆ نموونە بەو ئەندازەیەی عەلمانییە ئەوەندەش کاثولیکییە. . . فەرەنسا قەلاٚیەکی کاثولیکییەتە. لە هەموو رۆژئاوادا هەستی نەصرانی ئامادەیە بۆ وروژاندان، مرۆڤی رۆژئاوایی لە گەرمەی ژیانی خۆیدا نەصرانیەتی لە یاد دەچێت بەلاٚم تاقیی بکەرەوەو ئەو نەصرانییەتە بخەرە بەردەم مەترسی وبزانە کاردانەوەی چییە ؟ بە تایبەتی ئەگەر مەترسییەکە لە هەڵگری ئاینێکی ترەوە هابێت.

له ئه‌مه‌ریكادا و به پێی (هارۆڵد لاسكی)ی بیریاری به‌ریتانی كه‌س وه‌كو مرۆڤێكی بێباوه‌ڕ ناچێته هه‌ڵبژاردن چونكه ده‌دۆڕێت[٣٩].(لاسكی) ئه‌مه‌ی به‌ر له نزیكی په‌نجا ساڵ ووتبو به‌ڵام قسه‌كانی تا ئه‌مڕۆ ڕاستن، به‌ڵكو له جارانیش زیاتر ته‌ئكید بوون.

له (جیمی كارته‌ر)ی سه‌رۆكی پێشووی ئه‌مه‌ریكاوه به‌دواوه ئنجیل هاوڕێی سه‌رۆكانی ئه‌مریكایه له ووتارو گه‌شته‌كانیاندا.

ئایینی كۆن ده‌بوژێنه‌وه، ئایینی نوێش سه‌ر هه‌ڵده‌ده‌ن،ئاینی نویَ رۆژانه به‌رهه‌م ده‌هێنرێن ، بۆ نموونه به‌ر له (٣٠)ساڵ باسی‌شاری (لۆس ئه‌نجلس)ی ئه‌مریكا كراوه كه گه‌وره‌ترین ژماره‌ی ئایینی نویَ به‌رهه‌م ده‌هێنێت : له‌رۆژێكدا پێنج ئایین یان مه‌زهه‌بی ئایینی[٤٠] .ئه‌ی ده‌بێت ئه‌مرۆ كه هه‌ستی ئایینی ئه‌مه‌ریكی به‌رزتر بۆته‌وه ئه‌و ژماره‌یه چه‌ند بێت؟

وڵاتانی تریش له‌م به‌رهه‌م هێنانه بێبه‌ش نین. له به‌ریتانیادا پێنج سه‌د كۆمه‌ڵی ئایینی جیاجیا هه‌ن [٤١]. رۆژئاوا موناڧه‌سه‌ی هندستان ده‌كات ،رۆژئاوا بۆ رۆژهه‌ڵات ده‌گه‌رێته‌وه، له م قسه‌یه راستتر ئه‌وه‌یه : رۆژئاواو رۆژ هه‌ڵات یه‌كن چونكه مرۆڤ یه‌كه.

ئه‌گه‌ر عه‌لمانییه‌ت له برەودا بێت چۆن ته‌فسیری ئه‌و رابوونه ئه‌و ئاینییه بكه‌ین ؟ چۆن ته‌فسیری سه‌رهه‌ڵدانی شه‌یتان په‌رستی بكه‌ین ؟ شه‌یتان په‌رستن لای ئێمه سه‌یرترین ئایینه به‌ڵام له‌وێش سه‌یر تر هه‌یه‌وله دوارۆژیشدا له‌مانه سه‌یرتره‌ده‌بینین.

زۆر كه‌س ده‌ڵێن كه سه‌ده‌ی بیست ویه‌كه‌می زایینی سه‌ده‌یه‌كه‌ی ئایینی ده‌بێت.. بیٌ گومان سه‌ده‌ی ئاسووده‌یی نابێت چونكه ئایینیه زه‌مینییه‌كان به‌رهه‌مێكی نه‌خۆشییه‌كانی جیهانن بۆیه خۆشیان ئایینێكی نه‌خۆشن، پڕ مه‌ترسین، ئه‌مه‌ش هه‌مووی ئه‌نجامی لادانه له ئایینی راسته‌قینه، ئه‌نجامی عه‌لمانییه‌تی گومڕایه.

## په‌راوێزو سه‌رچاوه


١. ارنولد ج. توینبی، بحث في التأريخ (كورته‌ی شه‌ش به‌رگی یه‌كه‌م)، ج١، طه باقر، بغداد. ١٩٥٥، ل ٣٤٩.

٢. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه، ل ٤٦٧.

٣. سه‌رچاوه‌ی ل ٤٣٢.

٤. ر. بودون و ف. بوریكو. المعجم النقدي لعلم الاجتماع، ت. الدكتور سليم حداد، بيروت، ١٩٨٦، ل ٣٢٣، ئه‌م قسه‌یه‌ش له (ریمۆن ئارۆن)ه‌وه وه‌رگیراوه.

٥. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه.

٦. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه، ل ٣٢٤.

٧. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه، ل ٣٢٣.

٨. توینبی، بحث في التأريخ، ج٢، ل ١٨٥.

٩. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه، ل ١٨٦.

١٠. نموونه زۆرن به‌ڵام ته‌نها یه‌كێكیان ده‌هێنمه‌وه: پاش شۆڕشی فه‌ره‌نسا هه‌رچه‌نده ده‌ست به‌سه‌ر موڵك و داهاتی كه‌نیسه‌دا گیرا و ئیجرائات كرا به‌رامبه‌ر كه‌نیسه به‌ڵام ئه‌نجوومه‌نی وولآت رازی نه‌بوو كه‌نیسه له ده‌وڵه‌ت جیا بكاته‌وه و ئایین لای ئه‌و له‌وه گرنگتر بوو له‌ده‌ستی قه‌شه‌كان بێت به‌ته‌نیا، بڕوانه : رۆبه‌رت پاڵمه‌ر، الثورة الفرنسية وامتداداتها. ت، هنريت عبود، بيروت، ١٩٨٢، ل ٩٧.

١١. فوستیل دی كولانج، المدينة العتيقة، دراسة لعبادة الأغريق و الرومان و شرعهم و أنظمتهم، ت. عباس بيومى بك، القاهرة ١٩٥٠، ل ٥.

١٢. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه، ل١٢.

١٣. سه‌رچاوه‌ی سه‌ره‌وه، ل ٣٣.

١٤. ول ديورانت، قصه الحضارة، ج٣، ت. دكتور زكى نجيب محمود، ل ٣٢.

١٥. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢١.
١٦. ا.توینبی، بحث في التأريخ، ج١، ل ٢١.
١٧. لێرەدا مەبەست لە ئارییەکان هندو ئەوروپاییەکانی هیندستان، (حیثی)یەکانیش گەلێکی تورکیای کۆن بوون (زیاتر لە ٣٦٠٠ ساڵ پێش ئێستا).
١٨. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٩٥.
١٩. ماکس ڤیبر، الاخلاق البروتستانتیه و الروح الرأسمالیه، ت. محمد علی مقلد، بیروت، ساڵ ؟، ل ٢٨.
٢٠. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٣٧.
٢١. سەرچاوەی سەرەوە، ل٥٧.
٢٢. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٧.
٢٣. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٩.
٢٤. بڕوانە : کلۆد لیڤی — شتراوس ، الفکر البری، ت. الدکتور نظیر جاهل، بیروت، ١٩٨٤، ل ١٢٥ بەدواوە.
٢٥. سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٥٢.
٢٦. سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٥٣.
٢٧. بڕوانە : سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٧٧.
٢٨. لوسی مەیر، مقدمه في الأنثروبولوجیا الاجتماعیة، ت. الدکتور شاکر مصطفی سلیم، بغداد، ساڵ ؟، ل ١٣٢.
٢٩. سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٢٨.
٣٠. سەرچاوەی سەرەوە، ل ١٣١.
٣١. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٢٤٥.
٣٢. پیار کلاستر، مجتمع اللادوله، ت.الدکتور محمد حسین دکروب، بیروت، ط٢، ١٩٨٢، ل ١٥٩.
٣٣. بڕوانە بۆ ئەمە و نموونەی تر : سیگمۆند فرۆید، الطوطم و الحرام، ت. جورج طرابیشي، بیروت، ١٩٨٢، ل ٦٨ — ٧١.
٣٤. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦١ – ٦٢.
٣٥. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦٥ بەدواوە.
٣٦. سەرچاوەی سەرەوە، ل ٦٦.
٣٧. بودون و بوریکو، المعجم النقدی لعلم الاجتماع ، ل ٣٢٣.
٣٨. أ.توینبی، بحث في التأریخ، ج٢، ل١٧٦.
٣٩. هارۆڵد لاسکی، الدیمقراطیة الأمریکیة في السیاسة و الآقتصاد، ت. الدکتور راشد البدوی، ١٩٦٠، ل ٣٧.
٤٠. الدکتور حاتم الکعبي، السلوك الجمعی، ج ١، بغداد، ل ٩٣.
٤١. لەبارەی کۆمەڵەی ئاینیەنهێنیەکانی بەریتانیا بڕوانە گۆڤاری (المجتمع)ی کوێتی ژمارە ١١٨٣، ٩ — ١٩٩٦/١/١٥، ل ٢٠ بەدواوە.

# دەوڵـەت لەكوردسـتانـدا

## گەڕان بەدوای هۆكاری دروست نەبوونی دەوڵەتی كوردستانی لەكۆنەوە تا ئەمڕۆ*

### پرسـیاری لـەپێشـتر

زۆر هەوڵ دراوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە (هۆی دروست نەبوونی دەوڵەتی كوردی چیە؟)

بەڵام لەبەر ساكاری وەڵامەكان دەبوایە بمانپرسیایە: (هۆی چیە ئێمە نازانین بۆچی ئەو دەوڵەتە دروست نەبووە؟)

ئەم باسەمان ئیدیعای ئەوە ناكات كە هەموو هۆكانی دەستنیشان كردووە، هەروەها ئەو شەرەفە بەخۆی نادات كە چیی تێدا وتراوە هەموو حاڵەتەكان دەگرێتەوە. بێگومان لەوانەیە هۆیتر هەبن، لەوانەشە هەندێك لەو هۆیانەی كە باسمان كردوون هەڵە بن یان زیاد لەپێویست تەئكیدمان لەسەركردبێت..

هـەروەها شـتێكە مناقەشـەی ناوێت كـەوا چی لێرەدا وتـراوە بریتیـە لـە (بڕیـارێكی گشـتی)و بـەزۆری حاڵەتـە گشـتیەكانی وەرگرتووە بۆیە نمونەی (شاذ) و پێچەوانە بەباسەكەمان لەمێژووی كوردستاندا بەدی دەكرێن، بەڵام پـاش هـەموو ئـەو هـەموو (احتیاطات)ە ئەوەی گرنگە حاڵەتە گشتیەكەیە كە حساب تەنها بۆ ئەو دەكرێت.

### دەروازەیەكی هەڵە بۆ كێشەیەكی گەورە

(سـۆز) و (زاڵكردنـی ئایدیۆلۆجیـا) دوو دەروازەی هەڵـەن بـۆ وەڵامدانـەوەی پرسـیاری (بۆچـی دەوڵـەتی كـوردی دروسـت نـەبووە؟). ئـەو سۆزەیە هـانی رەخنـەگرێك لەئیسلام دەدات گوناهی دروست نـەبوونی دەوڵەتەكە بخاتـە پـاڵ ئیسـلام و ئـەو راستیەی لەیاد ببات كەوا سەدان سـاڵ بـەر لـەهاتنی ئیسلام كـورد خـاوەنی دەوڵـەت نـەبوو، لـەڕووخانی دەوڵـەتی (ماد)ەوە تا هاتنی ئیسلام نزیكی ١٢٠٠ ساڵە و كوردستان دەوڵەتی دانەمەزراند.

سۆز پاڵ بە ئیسلامییەك دەنێت كە گوناهەكە بخاتـە پـاڵ دەوڵەتـە رۆژئاواییـەكان كـە ئەمـە بـۆ خـۆی راسـتە بـەڵام ئەمـە تەنها هۆیەكە لەناو چەندین هۆی دیكە.

دەروازەیەكی هەڵەی تر ملكەچ كردنی رابوردووە بۆ ساتی ئێستامان. مەسەلەی دەوڵەتی نەتەوەیی چ بۆ كورد و چ بۆ هەموو گەلانی تر لە سەردەمە ئیسلامیەكاندا مەسەلەیەكی تەرح كراو نەبوو.

بەپاڵ (سۆز)، (نەزانی) هەیە. هـەندێك كـەس بێزانیـاری بـاس لەكێشـەكە دەكـەن. كێشـەكە زانیـاریی زۆری پێویسـتە تـا لێـی تێبگەین و نهێنییەكانی بدۆزینەوە:-

١- مێـژووی كوردستان (بەكۆن و نوێوە) گـەورەترین یارمەتیدەرمانـە بـۆ ناسـینی نەخۆشـییەكان، بـەڵام زۆربـەی نووسـین لەبارەی ئەم مێژووەوە (بەتایبەتی مێژووی كۆن) زانستی نین. من بـۆ خـۆم شـتی وا دەبینـم لـەبارەی مێـژووی كـۆنی كوردسـتان بڵاوكراوەتەوە كە پێكەنین پێیان شتێكی كەمە.

٢- مێـژووی سـەرجەم جیهان ئەهمیـەتێكی گرنگـی خـۆی هەیـە چونكە لـەناو لاپـەڕەكانی ئـەو مێـژووەدا دامـەزران و نـەمانی دەوڵەتان دەبینین. بەخوێندنەوەیەكی ورد و فراوانی مێژووی مرۆڤایـەتی لەگـەڵ وردبینیـەك لەهەڵهێنجانی ئەنجامـەكان مـرۆڤ دەتوانێت بگاتە چەند یاسایەك یان چەند بنەمایەكی گشتی سەبارەت بەدەوڵەت.

٣- زانستە سیاسییەكان دەوری خۆیان لەم مەیدانەدا دەبینن.

٤- شارەزابوونیش لەلایەنی سەربازی دیسان گرنگە.

* گۆڤاری رابـەر ژمارە ٣٧،بەهاری ١٩٩٩.

٥- رەنگە پێویستیشمان بەزانستی تر هەبێت وەك دەروونناسی بۆ ناسینی پاڵنەرە دەروونییەکان و تێگەیشتن لەکەسایەتیی مرۆڤ و بۆ ناسینی نەفسیەتی کورد و گەلانی دەوروبەری، هەروەها کۆمەڵناسی بۆ ناسینی یاسا کۆمەڵایەتییەکان و تەوژمەکانی کۆمەڵگە....تاد.

٦- ناسینی حاڵەتە هاوشێوەکان، واتە ئەو گەلانەی کە وەکو کورد نەیانتوانیوە دەوڵەت دابمەزرێنن.

کەواتە پێویستە بەر لەوەی قسە دەربارەی ئەم کێشەیە بکەین لەخۆمان بپرسین: زانیاریی ئێمە لەبارەی ئەم بابەتە چەندە؟

## کێشەیەکی مێژوویی

لەمێژووی کوردستاندا و بەدرێژایی زیاد لە (٥٠٠٠)ساڵ (باسی چەرخە بەردینەکانیش ناکەین) تەنها چەند نموونەیەکی کەمی دەوڵەت دەبینین:-

١- زوو دەوڵەتێك هەبوو بەناوی خامازی (دەوروبەری ٢٥٠٠ پێش زاین تا دەوروبەری ٢٣٠٠ پێش زاین) کە زۆر لەوە دەچێت گوندی (خەمزە)ی شارباژێر پاشماوەی بێت. ئەم دەوڵەتە دەستەڵاتێکی گەورەی هەبوو[1].

٢- دەوڵەتی گوتی (کۆتایی سەدەی ٢٣ تا کۆتایی سەدەی ٢٢ی پێش زاین).

٣- دەوڵەتی میتانی لەکوردستانی باکوور کە دەستەڵاتی گەیشتبووە کەرکووك (سەدەی ١٥ تا سەدەی ١٤ی پێش زاین).

٤- دەوڵەتی ماد (سەدەی حەوت پ.ز تا سەدەی شەشەم پ.ز.)

٥- هەر گەلێکیش لەکوردستاندا جاروبار دەوڵەتی یەکگرتووی خۆی دروست دەکرد.

کوردستانی کۆن و بەر لەکورد چەند گەلێکی تیادا دەژیا و حسابی دەوڵەت تەنها بۆ ئەو گەلانە دەکەین کە توانیبێتیان دەوڵەتێکی یەکگرتوو دابمەزرێنن نەك وڵاتەکەیان لەژمارەیەك ئەمارەت پێك هاتبێت.

ماوەیەکی زۆریش پێش دەوڵەتی ماد، هەروەها لەو دەوڵەتەوە تا ئەمڕۆ هیچ دەوڵەتێکی کوردستانیی و سەرتاسەری دروست نەبووە، حسابیش بۆ ئەمارەتە کوردیەکان ناکەین چونکە ناوی دەوڵەتی کوردییان بەسەردا ناسەپێت.

لەمەوە دەزانین کە نەبوونی دەوڵەت (بەو واتایەی مەبەستمانە) لەکوردستاندا کێشەیەکی نوێ نییە و رەگی لەناو مێژوودا داکوتراوە.

## مێژووی دووبارە بووی کوردستان

ئەگەر کەسێك گومانی لە دووبارە بوونەوەی مێژوو هەیە با سەرنجی مێژووی کوردستان بدات تا بزانێت چۆن لەم وڵاتەدا مێژوو سێجار و دەجار خۆی دووبارە دەکاتەوە. ئەگەر ناسینی مێژووش بۆ گەلانی تر کارێکی گرنگە ناسینی مێژوو بۆ کوردستان شتێکی ئەساسییە.

ئەگەر شارەزای مێژووی کوردستان بین نموونەی زۆر لەسەر ئەم دووبارە بوونەوەیە دەدۆزینەوە، با هەندێکیش لەو نمونانە بخەینە روو:-

لەناوچەی سلێمانی و شارەزوور گەلێك نیشتەجێ بوو بوو بەناوی (لوللو) کە لەم دواییەدا کتێبێکمان لەبارەیەوە بڵاوکردەوە. وڵاتی ئەم گەلە بەلای کەمەوە لەهەزاری یەکەمی پێش زاین پێی دەوترا زاموا Zamua ئەم گەلە نزیکی ٤٣٠٠ ساڵ بەر لەئێستا مێژوو ناوی تۆمار دەکات و تا دوای زیاد لە ١٧٠٠ ساڵ دەمێنێت. وڵاتەکەشی لەگەورەترین فراوانبوونیدا هاوجووتی پارێزگای سلێمانی بوو و شتێك زیاتر (سلێمانی پێش راپەرینی١٩٩١ و پێش دامەزراندنی پارێزگای دووەمی کەرکووك).

رەنگە ئەم هاوجووتیە زۆر سەرنجی خوێنەر رانەکێشێت و لەوانەیە بڵێت کە شتێکی (سیحری)ی تێدا نییە، چونکە سنوورەکانی پارێزگای سلێمانی دەستکردن بەڵام با پەلە نەکەین:

(٢٣) یان (٢٤) سەدە پاش نەمانی ئەم گەلە ئەمارەتی (بابان) هەمان سنووری هەبوو (لەگەڵ جیاوازیی کەم یان زۆر)، دوای ئەو ئەمارەتەش حکومەتی شێخ مەحموود هەمان سنووری هەبوو، ئەمرۆش دەسەڵاتی (ی.ن.ك) هەمان سنووری هەیە. ئایا ئەمە رێکەوتە؟ یان ئایا هەر یەك لەمانە هۆشیارانە هەوڵی داوە مێژووی ئەو گەلە دووبارە بکاتەوە؟

ئەمیرەکانی بابان نەك هەر ئاگاداری مێژووی ئەو گەلە نەبوون، بەڵکو تەنانەت

ناویشیان نەبیستبوو. شێخ مەحمووودیش هەروا، بەرپرسانی (ی.ن.ك)یش هەر ئەوەندە لەمێژووی ئەو گەلە شارەزان کە لە بابەتە ((مێژوویی))یە لابەلاکانی کتێب و گۆڤارە کوردیەکاندا هەیە. کەواتە هیچ لەمانە کە لەسەر خاکی (زاموا) ژیاون هەوڵیان نەداوە مێژوو دووبارە بکەنەوە، بەڵام خۆ ئەمە رێکەوت نییە.

هیچ پەیوەندییەکی ئایینی و نەتەوەییش نییە لەنێوان ئەو گەلە لەلایەك و بابانیەکان و شێخ مەحموود و (ی.ن.ك) لەلاکەیتر. پەیوەستە فیکرەییەکانی نێوان ئەو چوار ئەکتەرەش تا بڵێی لاوازە ئەگەر ئەسڵەن هەبێت. ئەمانە تەنها میراتگری زەوی و هەڵەکانی یەکترن هیچی تر.

مەسەلە نە میراتیی ئایینی و نەتەوەیی و فیکرییە و نە هەوڵێکی هۆشیارانەی دووبارەکردنەوەی مێژوو و نەرێکەوتیشە.

دووبارە بوونەوەی مێژوو بەم ئاستە نەوەستاوە بەڵکو هەروەها هەندێك وردە رووداویشی گرتۆتەوە.

ساڵی ٨٨١ی پێش زاین میرانی (زاموا) دژی پادشای ئاشوری (ئاشور ناصیرپالی دووەم) یەکیان گرت و دەربەندی (بازیان)یان بەدیوارێك داخست بەڵام لەوێدا شکان[٢].

عەبدولرەحمان پاشای بابان پاش ٢٧٠٠ ساڵ بەهەمان شێوەو دژی والی بەغدا دووجار دەربەندی بازیانی داخست و هەردوو جارەکە هێزی والی لەدەربەندێکەوە دزەی کرد و پشتی لێگرت[٣]. شێخ مەحمود لەشەڕەکەیدا دژی ئینگلیز لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دیواری دروست نەکرد بەڵام هەر لەوێدا شەڕی کرد و شکا.

شوێنەوار ناس (سپایزەر) کە لە بیستەکاندا هاتبووە ناوچەکە بەراوردێکی ترمان بۆ دەکات:

ساڵی ٨٨١و پاش شکانی میرانی ناوچەکە دەرکەوتووترین میری زاموا رووی کردە ناوچەیەك کە پێدەچێت ناوچەی کێوەکانی (سورێن) بێت، واتە نزیك پێنجوێن، شەڕە دوایەمینەکانی ساڵی دواییتریش (٨٨٠پ.ز) دژی میری زاموا لەدەشتی ناوچەی پێنجوێندا بوو. شێخ مەحمودیش دوای شەڕی بازیان رووی کردە ناوچەی پێنجوێن[٤]. دەشزانین کەوا کۆڕەوەکەی ١٩٩١ی ناوچەی سلێمانی بەزۆری بۆ پێنجوێن و شارباژێڕ بوو. پاش ٣١ی ئابی ١٩٩٦ هێزەکانی (ی.ن.ك) روویان کردە ئەو دوو ناوچەیە. لەهەموو نموونەکانیشدا قورسایی هێزەکان لەناوچەی پێنجوێندا بوون.

ئەمرۆ ئەگەر مێژووی کوردستان لە ئەلفەوە بۆ یا لەبەر دەستماندا بووایە دەبووە گەمەیەکی خۆش بۆ قوتابیان ئەگەر مامۆستا داوای دۆزینەوەی رووداوە لەیەکچووەکانی لێ بکردنایە. بەڵام ئێمە گەمە ناکەین و پێویستە شوێنی ئەم دووبارە بوونانە بکەوین تا هۆکانیان بدۆزینەوە. ئەگەر ئەمەمان بۆ کرا بەشێکی گەورە لە وەڵامی کێشەی دەوڵەتمان دەستگیر دەبێت.

## هـــــۆکـــــارەکان

هۆکانی نەبوونی دەوڵەتی کوردی دوانن: دەرەکی و ناوەوە. مەبەستمان لەدەرەکی کاری وڵاتان و دەوڵەتان و گەلانی دەوروبەر و جیهان. بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو وڵاتێك دەکەوێتە ژێر ئەم جۆرە کارە دەرەکیەوەو لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەو وڵاتانە بوونە دەوڵەت، پێویستە زیاتر تەئکید لەسەر هۆی ناوەوە بکەین، کوردستان کوشتەی (دەرەکی)یە بەڵام (ناوەوە) کوشندەترە بۆی.

## نەخشەیەکی هۆکانی ناوە

هۆی یەکەم و سەرەکیی ناوەوەی نەبوونی دەوڵەتی کوردستانی بەبڕوامان دواکەوتنە. ئەم دواکەوتنەش هۆیەکی سەرەکیی (لەناو چەندین هۆی تر) لەپشتەوەیە کە گۆشەگیرییە. تێکەڵاو بوون بەجیهانی دەرەوە یان هیچ نەبێت ئاگادار بوون لەو جیهانە گۆشەگیری کەم دەکاتەوەو رێگە لەدواکەوتن دەگرێت. دیسان ئەم گۆشەگیرییە هۆی هەیە کە جوگرافیای وڵاتەکەیە. کوردستان

وڵاتێکی شاخاوییە بۆیە گۆشەگیرە. ئەم لایەنە جوگرافی و تۆپۆگرافییەش بۆتە هۆی دیاردەیەکی تر ئەویش پەرتەوازەیی.
کەواتە نەخشەکەمان کە قابیلی دەستکاری کردنە بەم جۆرەی لێدێت (سەبارەت بەهۆی ناوەوە بە تەنیا):




ئەم هۆیانەی سەرەوەش (گۆشەگیری، دواکەوتن، پەرتەوازەیی) شتیتر کاریان تێدەکەن، هەروەها هۆی ناوەوەیتر هەن بۆ نەبوونی دەوڵەت غەیری ئەمانە بەڵام بەبڕوامان ئەمانە (لەگەڵ جوگرافیادا) هۆی سەرەکین. با لەیادیشمان نەچێت: هۆی ناوەوەی سەرەکی.

## یەکەم: جیۆپۆلیتیکی کوردستان

### ١- کوردستانی سەرەڕێ

بەتەماشایەکی سەرپێیی نەخشەی جوگرافی کوردستان و دەوروبەری بۆمان دەردەکەوێت کەوا کوردستان یەکێکە لە سنوورە کەمەکانی بەیەك گەیشتنی ڕۆژهەڵات (ئێران، هندستان، چین) و ڕۆژئاوا. هەر هێرشێکی ڕۆژئاواش بۆ ڕۆژهەڵات و بەپێچەوانەوە پێویستە بەچەند شوێنێکی کەمدا تێپەڕێت کە کوردستان یەکێکیانە. کاتێکیش ماڵەکەت ببێتە سەرەڕێ نە سەربەخۆییت دەست دەکەوێت و نەبایەخ بەبیناکردنی ماڵەکەت دەدەیت:

١) سەربەخۆیی: گریمان دەوڵەتێکی دیاری کراو دەیەوێت کوردستان بگرێت؛ خەڵکەکە بەرگری دەکەن، کاتێکیش دەشکێن ڕوو دەکەنە کێوەکان، ئەگەر لەوێشدا شکان و سەرجەم وڵاتەکە گیرا جەنگ کۆتایی پێدێت. دەوڵەتی داگیرکەریش ئەگەر قەناعەت بەوە بکات کوردستان دەبێتە سنوورێکی لەگەڵ دەوڵەتێکیتر کە کەوتۆتە پشت کوردستان، بەڵام ئەگەر دەوڵەتی داگیرکەر چاوی بڕییە پشت کوردستان، ئەو کاتە کوردستان دەبێتە سنوورێکی نزیك و ڕێڕەوێك بۆ گەشتن بەسنوورێکی دوورتر.. لێرەدا کوردستان بووە سەرەڕێ و سەرەبەخۆییەکەی دوورتر کەوتەوە چونکە هێزی داگیرکەر زیاتر خۆی لەسەر جەستەی سەپاند.

٢) کە وڵاتەکەش بووە سەرەڕێ بۆ لەشکرەکان؛ بنیات نانی ئابووری و سەربازیی وڵاتەکە دەبێتە گرانترین کار. وڵات سوود لەوە وەردەگرێت کە ببێتە ڕێگەی بازرگانی و داهات بۆ خۆی کۆبکاتەوە نەك خواردن بەلەشکری دەوڵەتی داگیرکەر بدات.

### ٢-قەڵاکانی پشتەوە

وڵاتی سەرەڕێ چیتر ناتوانێت پەناگەیەك بدۆزێتەوە بۆ دامەزراندنی ئەمارەتێك و لەشکرێك کە ببنە بنکەو نەواتی سەربەخۆبوونەوەو ناتوانێت بستێك زەوی بۆ کۆکردنەوەی داهات بۆ ئەو نەواتە دابین بکات.

وڵاتی سەرەڕێ چیتر قەڵای پشتەوەی نامێنێت.. مەبەستی ئێمە لەقەڵای پشتەوە ئەو قەڵایە نییە کە بەداروبەرد دروست دەکرێت، بەڵکو ئەو زەوییە ئازادکراوە ئەمینەیە کە وەکو بنکەیەکی کارکردن دەشێت.

ساڵی ٨٨١ و ٨٨٠ی پێش زاین کە شەرەخوێناوییەکانی زاموا بەداگیرکردنی لەلایەن پادشای ئاشورەوە (ئاشور ناصرپالی دووەم) کۆتاییان پێهات، زاموا بووە سنوورێکی ڕۆژهەڵاتی بۆ دەوڵەتی ئاشور، بەڵام کاتێك پادشای دوای ئەو (شالمانەسەری سێیەم) جەنگەکەی گواستەوە ناو کوردستانی ئێران، زاموا بووە سەرەڕێ. جەنگی دواییتری

ئاشور و تا دوای دوو سەدە بۆ جێگیرکردنی دەستەڵاتەکەیان بوو لەوڵاتی (ماد)و ماننا M anna و ناوچەکانی باشووریان و تا کرماشان کە هەموو ئەمانە کەوتوونەتە ئەودیو زاموا، زامواش زیاتر و زیاتر بووە سەرەڕێ و قەڵاکانی پشتەوەی نەماو لەگەڵ نەمانیان هیوای سەربەخۆبوونەوەی نەما.

جەنگەکە ئیتر لەوڵاتی (ماد)دا بوو، مادەکان گەلێکی بەهێز بوون، بەڵام گرنگترین شت ئەوەبوو کە مەکینەی جەنگی ئاشوری نەیتوانی زۆرتر ڕووەو ڕۆژهەڵات بچێت و بەتەعبیری لێکۆڵەرەوەی عەسکەریی ناودار (کلاوسڤیتز) گەشتە خاڵی لوتکەی سەرکەوتن (نقطة ذروة الأنتصار)[٥]، ئاشور نەیتوانی ماد بکاتە سەرەڕێ بۆیە پاش هەموو لێدانێکی سەخت وڵاتی ماد هێشتا

قەڵاکانی پشتەوەی مابوو، هەر ئەو قەڵایانەش بوون کە مادەکانی لەتێکشکانێکی یەکجارەکی پاراست و پاشان بوونە بنکەی دەوڵەتێکی بەهێز کە هەرەسی بەئاشور هێنا.

دەوڵەتی (ئوراتو Urartu)ش کە پایتەختەکەی تەنیشت شاری (وان) بوو سنورێکی دوور بوو لەئاشور و لەگەڵ ئەوەشدا چەند جارێك لێدراو کە قووڵترینیان لەسەردەستی سارگۆنی دووەمی ئاشور (٧٢١-٧٠٥پ.ز) بوو بەڵام چونکە ئوراتو دوورتر بوو لە ئاشور (لەچاو ناوچەکانی تری کوردستانی باکوور) ئەوەندەی پێنەچوو وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ -ئەگەر چیش لاواز- دەرکەوتەوە.

وڵاتی (نائیری Nairi) نزیکتر بوو لەئاشور بەڵام پاش چەند جەنگێك و لەسەر دەستی چەند پادشایەك بووە سەرەڕێ بۆ ئوراتو (بڕوانە نەخشەکە بۆ شوێنی ئەمانە).

کوردستان پاش ئاشورییەکان زیاتر بووە سەرەڕێ و مەیدانی یەکەم و سەرەکی جەنگی نێوان دەوڵەتی ئەشکانی (پارثی) لەئێران و دەوڵەتی رۆما هەروەها نێوان دەوڵەتی ساسانی و دەوڵەتی رۆما (پاشان بیزەنتا) نێوان سەدەی یەکەمی پێش زاین تا دەرکەوتنی ئیسلام لەسەدەی حەوتی زاینی واتە بۆ ماوەی نزیکی هەشت سەدە.

### ٣- چیا و روبار

ئەوەی وتمان مەوقعی جوگرافییە، لەڕووی (تۆپۆگرافیا)شەوە کوردستان پڕە لە چیاو روبار، کاتێکیش وڵاتەکە سەرەڕێ بێت چاوەڕێی ئەوە دەکەین کە ئەوپەڕی تێکەڵی لەگەڵ گەلاندا هەبێت و ئەمەش وڵاتەکە پێش بخات بەڵام سەختیی ناوچەکە ببووە هۆی ئەوەی ئەمارەتەکان یان دەوڵەتی مەرکەزیی داگیرکەر نەتوانێت بەتەواوی کۆنترۆڵی وڵاتەکە بکات بۆیە زۆر کات رێگروجەردە هەبوون و رێگاوبانیان نائەمین دەکرد. بۆیە کوردستان لەدوو رووەوە تۆپۆگرافیاکەی دوای خست: یەکەمیان لەبەر رێخۆش کردن بۆ جەردەکان، دووەمیش لەبەر ئەوەی درووستکردنی رێگاوبان کارێکی گران بوو.لەبەر ئەوەش کوردستانی سەرەڕێی رێگەی کاروان نەبوو، بەڵکو زیاتر رێگەی لەشکر بوو، واتە: لاوازکردنی ئیمکاناتی پێشکەوتن بەهۆی نەبوونی رێگەی کاروان و تێکشکاندنی ئەو ئیمکانیاتەی بەهۆی هاتوچۆی لەشکرەکان.

#### دووەم: گۆشەگیری

بەهۆی ئەم سەختییەی کوردستانەوە گۆشەگیری مۆرکێکی زاڵی خەڵکی کوردستان بوو. بەم جۆرە هەردوو تایبەتیی (سەرەڕێ)و (گۆشەگیری) هەرچەندە دژ بەیەکن پێکەوە هەن و کاری سلبییان هەیە.

بێگومان پێویستە تێکەڵ بوون کاریگەر بێت واتە سوود لەتەجروبەو پێشکەوتنی وڵاتان وەربگیرێت هەروەك چۆن سوود لەپارەکەشیان وەر دەگیرێت کاتێك کاروانەکان بەوڵاتدا تێدەپەڕن ئەگینا بەتەنها ئاگادار بوون لەجیهانی دەوروبەر بەس نیە. جیهانی سێیەمیش کە دواکەوتووە هۆیەکی دواکەوتن ئەوەیە سوودی لەتەجروبەی رۆژئاوا لەمەیدانی زانست و تەکنەلۆجیادا وەرنەگرتووە، بەڵام کوردستان نە سوودەکەی وەرگرتووەو نە بەئاگاش بووە، هۆیەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قسەیەی کە دەڵێت کوردستان (ساحیبی) نییە، بێگومان کاتێکیش ساحیبێکی هەبووبێت ئەو ساحیبە لە (بەگ)ێك زیاتر نەبووە.

هەبوونی چیاو روبار نەك تەنها کوردستانی لەجیهان دوورخستووە بەڵکو هەروەها ناوچەکانی کوردستانیشی لەیەکتر جیاکردۆتەوە و کە ئەمە هۆیەکی زۆر کاریگەری نەبوونی دەوڵەتە. چیا و روبار گەلانی کۆنی کوردستانیان لەیەك جیاکردبووەوەو تا ئەمڕۆ کاری خۆیان دەکەن.

بەڵێ؛ گەلەکان لەسنوورەکاندا تێکەڵ بەیەك دەبن و خێڵەکان کۆچ دەکەن، بەڵام چیا و روبارەکان سنوور بۆ ئەم تێکەڵ بوونە دادەنێن.

تێبینی ئەوەش بکە کە زاری کرمانجی ژووروو لە (زێی بادینان)دا دەوەستێت. بێگومان زێ (پردی سیرات) یان (دیواری بەرلین) نییە و تێکەڵیی زارەکان لەم بەرو لەوبەری زێوە هەیە و زۆریشە، بەڵام ئەوەش راستە کە زێ سنووری بەرچاوی نێوان دوو زارەکەیە.

چیاو روبار وەکو سنورێکی سیاسیش دەور دەبینن، واتە وەکو سنورێکی نێوان قەوارە سیاسییەکان، وەك چۆن زێی دوکان بۆ ماوەیەك ببووە سنووری نێوان دوو ئەمارەتی (بابان) و (سۆران).

دیاره کردنەوەی ڕێگەوبان کاری جوگرافیا و تۆپۆگرافیا کەم دەکاتەوە. دەبوایە کارێکی هەرە گرنگی هەر فەرمانڕەوایەك دروست کردنی ڕێگەوبان و پرد بوایە. مەبەستیشمان دروست کردنی ڕێگەیەك و دوان یان پرد و لەتێك نییە بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە ڕێگەو پرد ئەوەندە زۆر و مەحکەم بوونایە کاری تۆپۆگرافیایان هەڵتەکاندایە.

دەوڵەتی (ڕۆما)ش ئەم کارەی کردبووە پرۆژەی بەردەوامی خۆی. یەکەم ڕێگە ئەو دەوڵەتە دروستی کردبوو ساڵی ٣١٢ پێش زاین دەستی پێکرا واتە پاش سەرکەوتنی ڕۆما بەسەر گەلی (سامنی) ساڵی ٣١٤ پێش زایین[٧] و درێژییەکەی نزیکەی (٢٢٠) کیلۆمەتر بوو[٨]. دروستکردنی ڕێگە بەردەوام بوو. لەئیتاڵیادا (٣٧٢) ڕێگەی سەرەکی هەبوون کە نزیکی (١٩٥) هەزار کیلۆمەتر درێژییان بوو، لەوڵاتانی ژێردەستی ڕۆماشدا نزیکی (٨٤٠) هەزار کیلۆمەتر ئەمەش جگە لەتۆڕێکی تری ڕێگەی لاوەکی[٩].

گۆشەگیریی بەشەکانی کوردستان و گۆشەگیری لەجیهان بەهۆی جوگرافیاوە (هەروەها بەهۆی باری ئەمنی) بوونە هۆی دواکەوتن، زاڵ بوونیش بەسەر ئەم گۆشەگیرییە چەند کارێکی پێویستە وەك دروستکردنی ڕێگەو بان و دامەزراندنی ئاسایش، پەیوەست بوونێکی کاریگەر بەجیهانی دەرەوە،...تاد.

## سێیەم: پەرتەوازەیی

لایەنی جوگرافی هۆکارێکی سەرەکیە بۆ پەرتەوازەیی. پەرتەوازەییش زیانی زۆرە:

١- قەت داهاتی هەر ئەمارەتێك ناگاتە داهاتی دەوڵەتێکی یەکگرتوو، داهاتیش کە زۆر بێت لەشکری وڵاتەکە گەورەتر دەبێت و پرۆژەی حکومی زۆر دەبن و کە یەکێکیان ڕێگەوبانە.

٢- بەش بوونی وڵات بەسەر چەند ئیمارەتێك واتای جەنگی حەتمیی نێوان ئەمارەتەکان و نەزیفی ئیمکانیاتیان. حەتمیەتی جەنگ نەك تەنها لەبەر مونافەسەی نێوان ئەمارەتەکان بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە جەنگی نێوان دوو ئەمارەت ئاسانترە لەجەنگی دەوڵەتێك لەگەڵ ئەوەی تر.

٣- ئەنجامی شەڕی ئەمارەتەکانیش دژی دەوڵەتێکی دراوسێ ئەنجامێکی زانراوە، زۆربەی کاتیش ئەمارەت نێچیرێکی باشە بۆ دەوڵەتی دراوسێ.

پەرتەوازەیش تایبەتێکی ناسراوی کوردە. (بەدلیسی) لەشەرەفنامەکەیدا دەڵێت کەوا کورد لەسەر ناکۆکی دروست بوون[١٠]. (کینان)ی ڕۆژئاواییش دەڵێت کورد ململانە دژی کوردێکیتر بەکارێکی ئاسانتر دەزانێت لەچاو ململانە لەگەڵ کەسێکیتردا[١١].

هۆی ئەمەش ئەوە نییە کە کورد وەك بەدلیسی دەڵێت لەسەر ناکۆکی دروست بووبێت بەڵکو بارودۆخەکە وای لێکردووە. ئەمیرەکان هاوشانی یەکتر بوون و هەریەکێکیان لەدەوڵەتی ئیقلیمی دراوسێ بێهێزترە بۆیە ئاسانترە لای کە دژی ئەمیرێکی هاوشانی خۆی شەڕ بکات، وەك لەشەڕی دژی دەوڵەتێك.

پەرتەوازەیی دەردێکی کۆنی کوردستانە، لەشەڕەکانی زاموادا بینیمان چۆن ژمارەیەك میر هەبوون، لەهەمان وڵاتداو بەر لە هەزار ساڵ لەو شەڕانە بەڵگەنامە هەیە لەسەر زۆریی پاشاکانی ئەوێ.

لە وڵاتی (نائیری)دا و لەکاتی پاشای ئاشوری توکولتی نینورتای‌یەکەم (١٢٤٤-١٢٠٨پ.ن) چل پادشای هەبوو(١٢). تیگلات پلاسەری یەکەمی ئاشوریش لەساڵی ١١١٣پ.ز باسی (٢٣) پادشای ئەو وڵاتە دەکات(١٣). ئەمانەش تەنها چەند نمونەیەکی کەمن. فرە ئەمارەتیش لەکوردستان بەر لەچەند سەدەیەك شتێکە هەموو کەس دەیزانێت، ئەمڕۆش لە لەتێکی کوردستاندا دوو حکومەت هەیە.

## شارێکی مەزن..... هۆیەکی مەزن

ئەگەر لە وڵاتێکدا ژمارەیەك شار هەبن و لەڕووی قەبارەوە وەکو یەك بن شتێکی چاوەڕوان کراوە کە هەر یەکێك لەم شارانە خۆی بەهاوشانی ئەویتر بزانێت، یان بەلای کەمەوە دەتوانێت ببێتە هاوشانی.

ئەگەر شارێکی واش بتوانێت ئەوانیتر داگیر بکات ئەوا ناتوانێت تا سەر ئەم دەستەڵاتەی خۆی بهێڵێتەوە... تەنها شارێکی گەورە ئەمەی بۆ دەکرێت.

بۆ نموونە ئەگەر ئەوسا دە شار هەبووبن کە ژمارەی دانیشتوانی هەر یەکێکیان (٣٠) هەزار کەسە، ئەو کاتە هەر یەکێکیان دەتوانێت ئەو پەڕەکەی پێنج هەزار چەکدار کۆبکاتەوە، پێنج هەزار چەکدار بەرامبەر پێنج هەزار چەکدار، ژمارەی ئەو چەکدارانەش کە شارەکە دەتوانێت لەشارو گوندەکانی دەوروبەر کۆیان بکاتەوە نزیکە لەو ژمارەیەی کە شارەکەی تر بۆی کۆدەبێتەوە.

چەندیش ژمارەی ئەو شارانەی کە شارەکەمان دەیەوێت داگیریان بکات زۆر بێت

ئەوەندەش ئەو پرۆژە فراوانکارییە ناماقووڵ دەبێت.

ئێستاش ئەگەر یەکێك لەو شارانە توانی ژمارەی دانیشتوانی زیاد بکات و بیگەیەنێتە سەد هەزار کەس، ئەوکاتە و بەپێی هەمان ڕێژە دەتوانێت زیاد لە (١٥) هەزار چەکدار کۆبکاتەوە و پرۆژەی داگیرکردن بەشێوەیەکی ئاسانتر بەجێ بهێنێت.

مەسەلەکەش نەك تەنها زیاد کردنی ژمارەی چەکداران نییە بەڵکو هەروەها زیادکردنی داهاتە، پەیداکردنی هەیبەتە، کەم کردنی هەستی هاوشانی و موونافەسە لای شارەکانی‌تر.

کوردستان پڕی بوو لە شارە هاوشانەکان، پڕی بوو لە ئەمارەتە هاوشانەکان، هیچیش لەمانە خۆی نەکردە ئەمارەتێك یان شارێکی بێ‌موونافس، بۆیە ئەگەر هەر یەکێك لەمانە شارەکان یان ئەمارەتەکانی تری قوت بدایە دەبوو زوو هەموویانی ((یەق)) بکردایەوە.

دانیشتوانی شاری سلێمانی (٣٦) ساڵ پاش دروست کردنی بەدەهەزار کەس مەزەندە کرابوو، نزیکی پەنجا ساڵیش دوای ئەوە ماڵەکانی نزیکی شەش هەزار بوون[١٤]. شارێکی وا پرۆژەی گەورەی فراوانکاری پێ‌ناکرێت.

مەکیاڤیللی (١٤٦٩-١٥٢٧ز) کە فکرەی شاری گەورەمان لەوەوە وەرگرتووە دەیوت کەوا ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی شارەکە زۆر نەبێت ئەوا شارەکە ناتوانێت کاری زۆر بەئەنجام بهێنێت.

مەکیاڤیللی شارەکە بە درەختێك دەشوبهێنێت و دەڵێت کە قەدێکی باریکی درەختێك هەرگیز ناتوانێت لقێکی قورس رابگرێت و نموونەی شاری رۆما بۆ قەدی ئەستوور و شاری (سپارتا) بۆ قەدی باریك دەهێنێتەوە.

رۆما بەهەردوو رێگەی خۆشی و زۆرەملێ ژمارەی دانیشتوانی خۆی زیاد دەکرد بۆیە لەسەردەمی شەشەمین پادشای خۆیدا -وەك مەکیاڤیللی دەڵێت- هەشتا هەزار چەکداری هەبوو پاشان لەسەردەمی کۆماریدا توانی (٢٨٠) هەزار کەس چەکدار بکات ئەمە لەکاتێکدا دوو شاری دەرکەوتووی یۆنان (ئەثینا) و (سپارتا) -چونکە حەزیان بەتێکەڵاوی نەدەکرد و هانی بێگانەکانیان نەدەدا بۆ جێگیر بوون لەشارەکەیاندا- نەیانتوانی لەهیچ کاتێکی مێژوویاندا زیاتر لە بیست هەزار کەس چەکدار بکەن، لەبەر ئەوەش کاتێك (سپارتا) توانی هەموو وڵاتی یۆنان بخاتە ژێر دەستی خۆی نەیتوانی دەوام بەمە بدات و زوو ئیمپراتۆریەتەکەی دۆڕاند. قەدێکی لاوازی وا لەگەڵ هەڵکردنی یەکەم بادا دەشکێت لەکاتێکدا ئەمە تووشی رۆما نەدەبوو چونکە قەدەکەی ئەوەندە گەورە بوو کە دەیتوانی هەرچی لق هەیە رایبگرێت[١٥].

بەم شێوەیەش هیچ لەئەمارەتەکانی کوردستان توانای ئەوەیان نەبوو ئەمارەتەکانی تر قووت بدەن، هەر هەوڵێکیش بۆ ئامانجێکی وا واتای خۆکوشتن بوو. ئەمەش حاڵی ئەمارەتی سۆران بوو کە پاش فراوانکردنی سنووری باشووری لەسەر حیسابی بابانیەکان و پاش قووت دانی ئەمارەتی بادینان ویستی ئەمارەتەکەی بەدرخان بگرێت و لەوێوە سەرەتای هەرەسی دەست پێ‌کرد.

جگە لەوەی کە شارەکانی کوردستان هاوشانی یەکتر بوون ئەو شارانە قەڵا بوون، یەکێکیش لەزیانەکانی قەڵا ئەوەیە هانی فەرمانڕەواکەی دەدات بۆ یاخی بوون لە ئەمیرەکە یان لەدەوڵەتی مەرکەزی، ئەمەش زۆر رووی داوەو ئەمە هۆیەکی پەرت بوونی ئەمارەتەکە یان دەوڵەتەکەیە.

لەمێژووی جیهانیشدا نموونەی فەرەنسای ئەوسا هەیە کاتێك هەر دەرەبەگێك دەیتوانی لەپادشای فەرەنسا یاخی ببێت چونکە قەڵای خۆی هەبوو.

کەواتە دەبوایە لە کوردستاندا شارێك هەبووایە کە دانیشتوانی دە ئەوەندەی گەورەترین شاری تری کوردستان بوایە بۆ ئەوەی هیچ شارێك هاوشانی نەبێت و بۆ ئەوەی بتوانێت هەموو ئەو شارانە بگرێت و دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا بهێڵێتەوە.

بێگومان ئەو شارە مەزنە پاش دەستگرتن بەسەر شارەکانی‌تر بێ‌کێشە نامێنێتەوەو دووچاری یاخی بوونێکی زۆر دەبێت بەڵام ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ قەدە باریکەکان ئەو شارە دەتوانێت باشتر و زیاتر بەردەوامی بە وەزعەکەی خۆی بدات.

## چوارەم: دواکەوتن

هەموو ئەوانەی سەرەوە دواکەوتن دەهێننە بەرهەم. دواکەوتنیش هەموو رووبەکی گرتۆتەوە؛ ئابووری، سیاسی، سەربازی، شارستانی.

داگیرکەر هەمیشە هەوڵ دەدات ژێردەستەکانی دواکەوتوو بن تا ژێر دەستەیی لایان شتێکی ئاسایی بێت، تەنانەت حوکمی نیشتمانی کاتێك ئیستبداد پیادە دەکات هەوڵ دەدات گەل دواکەوتوو بێت چونکە گەلی دواکەوتوو بەکۆیلێتی رازییە.

لەمێژووی کوردستاندا لەوە ناچێت داگیرکەر هۆشیارانە ویستبێتی دواکەوتن باڵ بەسەر کوردستاندا بکێشێت و دواکەوتن زیاتر ئەنجامی هۆکانی‌تر بوو. هەوڵی وشیارانەی سەپاندنی دواکەوتن زیاتر لەمێژووی نوێی کوردستاندا دەبینرێت.

لێرەدا چەند مەیدانێکی دواکەوتن دەستنیشان دەکەین کە گرنگترینیان دوواکەوتوویی پێشەواکان و دواکەوتوویی دەزگاکانن جگە لەچەند مەیدانێکی تر کە ئەهمیەتی پلەدوویان هەیە.

### ١- قەیرانی پێشەوایەتی

یەکێك لە نیشانەکانی دواکەوتوویی پێشەواکان تێنەگەیشتن و نەزانینی ئەهمیەتی شاری مەزن. نیشانەکانی‌تر زۆرن.

کورد پێشەوای زۆری هەبوو، پێشەوای زۆریش دیاردەیەکی باش نییە چونکە لەکەمی پێشەوای لێهاتوو پێشەوا زۆر دەبن.

کورد پێشەوای لێهاتووی هەبووە بەڵام کامەی لەناویاندا زۆر لێهاتوو بوو پێشەوایەك بوو لەسەر ئاستی کوردستان نەك لەسەر ئاستی ئیقلیمی چ جای جیهانی.

زۆر لەپێشەواکان لەچاو خەڵکەکە لوتکە بوون، بەڵام هەرگیز لەئاستی سەردەمەکەیاندا نەبوون.

پێشەواکان ئاگایان لە جیهانی دەوروبەریان نەبوو، میرێکی ئەمارەتی بابان یان بادینان نەیدەزانی لەئەوروپا چ باسە، (فرەیزەر) دەڵێت کە میری بابان بەردەوام نامەی بۆ دەنارد و لێی دەپرسیەوە لەبارەی بارودۆخی ئەوروپا و بەتایبەتی پەیوەندی نێوان رووسیا و عوسمانییەکان[١٧]. نموونەش لەمە باشتر نییە لەسەر بێئاگایی کە من چاوەڕێی کەسانێکی‌تر بم بۆ زانیاری.

دواکەوتنی پێشەوایەتی و بێئەوەی رووی تری ئەم دواکەوتنە بلێین ئەنجامی لێکەوتەوە:

١- هەموو پێشەواکان هاوشانی یەکتر بوون، بۆیە هیچ کامیان نەیتوانیوە ئەوانی‌تر بخاتە ژێر رکێفی خۆی یان بەبراگەورەیی ئەو رازی بن.

تا ئەمڕۆ ((براگەورەیی)) کەسێك دەیسەپێنێت کە شایەنی ئەو پلەیە نییە.

٢- بەڵام تەنانەت لەناو خودی ئەمارەتەکە کەسانێك هەبوون کە خۆیان بەهاوشانی ئەمیر دەزانی کە هەر وەکو قسەی (من چیم و خولەی شێخ سەعید چییە؟) مەبەست لە (شێخ مەحموود) روونی دەکردەوە. لاوازیی ئەمیر رێگەی بەم جۆرە موونافەسەیە داوە.

لەمەشەوە حەسوودی نێوان پێشەواکان سەری هەڵدەدا و خیانەت رووی دەدا، خەڵکی سادەی سەدەی رابردووش بەم حەسوودییەی نێوان پێشەواکانیان زانیبوو ئەمەیان بە (ریچ) وتبوو[١٨].

پێشەوای بێموونافیس، پێشەوا لەسەر ئاستی سەردەم دەست نەدەکەوت. (صلاح الدین) نموونەی پێشەوایەك بوو لەسەر ئاستی جیهانی، لەسەر ئاستی ئەرکەکانی جیهانی ئیسلامی، ئەمە لەکاتێکدا میرانی سەردەمی خۆی (بەمیرە کوردەکانەوە) لەبەگێگ زیاتر نەبوون، لەمەشەوە سادەیی رەخنەکانی هەندێك کورد دەزانین کە (صلاح الدین) بەوە تاوانبار دەکەن کە کاری بۆ کورد نەکردووە، هەورەها هەڵەی قەومییە عەرەبەکان کە صلاح الدین بەپاڵەوانی (عروبە) ناودەبەن. لەو سەردەمەدا جگە لەوەی کە فیکرەی نەتەوایەتی وجودی نەبوو، هەروەها هەر ئاڕاستە بوونێك بۆ

غەیری مەسەلەی جیهانی ئیسلامی پێشەواکەی دەکردە یەکێك لەو میرانەی کە بۆ بستێك زەوی دژی براکانیان شەڕیان دەکرد و ژیانی موسڵمانانیان خستبووە نارەحەتی.

یەکێك لەو تایبەتییانەی کە لە ژمارەیەك سەرکردەی کورددا دەبینرێت لەخۆبایی بوونە. ئەو سەرکردانە کاتی بەهێز بوون تووشی غرور دەبوون، تایبەتییەکی تر ملهوڕی و موغامەرە کردنە.

کوردستان پێویستی بەپێشەوایەك بوو کە دڵەکان لەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوە نەك دوژمن بۆ خۆی زۆر بکات.

(پاشای کۆرە) بەو هەموو لێهاتووییەی خۆیەوە دوژمنی لەخۆی کۆکردبووەوە ئەویش بەهۆی رەفتاری رەقەوە[19].

میری وا هەبوون کە شایەنی مەدح کرد بوون و مەدحیش کران وەکو سلێمان پاشایبابان، بەڵام نموونەکانی لەخۆبایی بوون و موغامەرە کردن کە لەمێژووی کوردستاندا دەیانبینین وامان لێدەکەن ئەم دوو دەردە بەنەخۆشییەکی بەربڵاو بزانین. وابزانین ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەرکردەکە لەهیچەوە بووە سەرکردە یان لەبێهێزییەوە دەسەڵاتی زۆری دەست کەوت.

(صلاح الدین) نموونەیەك بوو لەسەر ئەو سەرکردەیەی دڵەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە. (ابن شداد) نموونەی جۆراوجۆر لەسەنگ فراوانی و لێبوردنی لێدەگێڕێتەوە[20]، (صلاح الدین) چەندین شەڕی کردبوو دژی ئەمیرەکانی شام و جزیرە و شوێنانیتر بەڵام لەکۆتاییدا توانی هەموویان لەخۆی کۆبکاتەوەو هەموو دان بەپێشەوایەتییەکەی بنێن، نموونەیەکی خۆشویستنی خەڵك بۆ صلاح الدین هەڵوێستی خەڵکی دیاربەکر بوو کاتێك گەمارۆی دابوو وکاتێك میری شارەکە داوای لەخەڵکەکە کرد شەڕی لەگەڵ بکەن بەڵام خەڵکەکە رازی نەبوون. (ابن شداد) لەباسی مردنی (صلاح الدین)دا دەڵێت کەوا لەدوای مردنی خەلیفە راشیدەکان خەڵکی قەت ئەوەندە خەفەتیان بۆ کەس نەخواردبوو[21].

(صلاح الدین) دەیزانی ئەمیرەکان لەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوەو پێشەوای خۆشەویستی سەرجەم موسڵمانان بێت. وە نەبێت ئەمەی بەسیاسەت کردبێت، بەڵکو رەوشتی ئەسڵیی خۆی بووەو ئەنجامی بیرکردنەوە بوو لە مەسەلەی یەکەم و هەرەگرنگەکەی ئەو ساتە ئەویش دەرکردنی خاچ پەرستان. بەڵام زۆر لەبەگە کوردەکان تەنانەت وەکو سیاسەتیش ئەمەیان بۆ نەکرابوو بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێك لەوانە بەگیانێکی بنەبڕ کردن (استئصالی) بیریان دەکردەوەو زۆربەیان بەگیانی براگەورەییەکی فەرزکراو رەفتاریان دەکرد کاتێك نەختێك دەسەڵاتیان گەورەتر دەبوو، گیانی بنەبڕکردن و بیرکردنەوەی براگەورەیی تا ئەمڕۆ ماوە.

## شۆڕشی بێ لاشە

نیشانەیەکی دواکەوتوویی پێشەوایەتی ئەوەیە پێشەواکان نەیانتوانیبوو هێزی هەموو جەماوەر بخەنە جووڵە، بۆیە شۆڕشە کوردیەکان –ئەگەر راست بێت ناوی شۆڕش لەهەموویان بنرێت– بەزۆری کاری پێشەواکان بوو. پێشەوا لەگەڵ چەکدارەکانی شۆڕشەکەیان هەڵگیرساندبوو جەماوەریش کەمترین بەشداریی هەبوو لەپرۆژەکە.

با لەراپەڕینی ١٩٩١ەوە دەست پێبکەین؛ کام بیروباوەڕ و هەستی نەتەوایەتی لەوەی ١٩٩١ گەورەتر بوو؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمووومان بینیمان چۆن تەنها بەشێکی گەل بەشداری راپەڕینی کرد، بەشەکەی تریش خەریکی تاڵانی بوو، باقی خەڵکەکەش تەنها لایەنگیر بوون.

زۆریش باسی ((داستانی)) کۆڕەوی دوومليۆنی دەکرێت بێئەوەی حسابی ئەوە بکرێت کە دەتوانرا لەناو ئەو دوو ملیۆنە بەلای کەمەوە بیست هەزار چەکدار ئامادە بکرێت و داستانێکی راستەقینە تۆمار بکرێت. مەسەلەش نە کەمی چەك بوو (هەرچەندە چەك کەم بوو) و نە چەکی زۆری حکومەتی عێراقی، هەروەها کەمی بوار نەبوو چونکە ئێستا هەشت ساڵ بەسەر راپەڕیندا تێپەڕیوە بەڵام جەماوەر (تعبئە) نەکراوە بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو (مهرج)انەی کە دژی چەکداریو بۆ رازیکردنی هەندێك کەس قسە دەکەن بازاڕیان گەرمەو گوێیان بۆ دەگیرێت.

هۆی سەرنەگرتنی راپەڕینەکەی ١٩٩١ ئەو دەردە کۆنەیە: شۆڕشەکە بێلاشە بوو، ئەوەندە هەیە کە بەشداریی خەڵك لەم شۆڕشەدا نیسبەتێکی باشتری هەبوو (رەنگە جگە لەشۆڕشی ١٩٧٤)

ئەمە حاڵی (راپەڕینە مەزنەکە) ئەی دەبێت حاڵی شۆڕشەکانی تر چیبووبێت؟ زیانی نەبوون یان لاوازیی لاشەکە تەنها لەوەدا نییە کە ژمارەی چەکداران کەم بوو بەڵکو لەوەدایە کە گەل شەڕی درێژخایەنی ناوێت بۆیە بەشداری کردنی چالاکانەی گەل لەشۆڕشەکەدا هێزێکی وا بەو شۆڕشە دەبەخشێت کە پێشەواکان بتوانن درێژە بەشۆڕشەکە بدەن بێئەوەی گەل تاقەتی بچێت یان بەهۆی قوربانیەکانەوە سارد بێتەوە. چەکدارکردنی گەل بە (ئایدیۆلۆجیا) تاکە رێگەیەکە بۆ ئەم مەبەستە. ئەوەتا دەرکەوتووترین ئایدیۆلۆجیا ئەوەی شۆڕشی ١٩٧٤و راپەڕینی ١٩٩١ بوو بەڵام ئاکامی هەردووکیان دەزانین.

مەبەستیشمان ئەوە نییە کە تەنها وجوودی ئایدیۆلۆجیاکە بەسە بەڵکو دەبێت هەروەها ئەو ئایدیۆلۆجیایە زاڵ بێت و سەرجەم جەماوەر باوەڕێکی وایان پێبێت کە ئامادەبن قوربانیی درێژخایەنی لەپێناویدا بدەن. بێزاڵ بوونی ئایدیۆلۆجیا

جەماوەر (سباق المسافات الطويلة)ی بۆ ناكرێت. ئێستاش دیارە كە هیچ شۆڕشێكی كوردی نەیتوانیوە ئەمە بكات و ئەمەبوو كە هەموو شۆڕشێكی كوردی كردە شۆڕشێكی بێلاشە.

شۆڕشەكە بێلاشەیە، (سەر)ەكەش میرە نەك پێشەوا یان بەلای كەمەوە پێشەوایەكی ناوچەییە.. ئەنجامەكەش روون و ئاشكرایە.

### شۆڕش و موغامەرە

ئەمیان تەنها لەڕوویەكەوە پەیوەندی بەدواكەوتنەوە هەیە ئەویش حسابی هەڵە بۆ سات و ئیمكاناتی شۆڕش و زیاتر پەیوەندی هەیە بە پێشەواكانەوە.

لەمێژووی كوردستاندا شۆڕشی زۆر هەن، ئەمانەش بەزۆری موغامەرە بوون، شۆڕشێك بوون بێحساب كردنی ئیمكاناتی خۆ و دەوروبەر، بەڵێ باشە با شۆڕش بكەین ئەی دوایی؟ چۆن دەوام بەو دەسەڵاتە بدرێت ئەگەر هاتە دەستمان؟

لەوەدەچێت هەر ئەوەندی پێشەواكان هێزێكیان بۆ خۆیان خڕەكردەوە بیریان لەوە دەكرد دژی دەوڵەتی داگیركەر بجەنگێن یان پەلاماری دراوسێ بدەن.

پادشای ئاشور لەشەڕی ساڵی (٨٨١پ.ز) دەڵێت كە زامواییەكان (بڕوایان بەلەشكرەكەیان هەبووە). دیارە نەلەشكرەكە هاوشانی لەشكری ئاشووری بووو نە ئەو هاوپەیمانیە شلەی نێوان چەند میرێك دەتوانێت بەرامبەر لەشكرێك بوەستێت كە هی یەك دەوڵەت و لەژێر یەك پادشا بوو.

بەكورتی شۆڕشەكانی كوردستان زۆربەی كات موغامەرە بوون و ئاكامی هەموویان ژێركەوتن بوو.

### هاوپەیمانییە چەوتەكان

كاتێك میرەكە خۆی لەنێوان دوو هێزدا دەبینێتەوەو كاتێك بەپێویستی دەزانێت هاوپەیمانی لەگەڵ هێزێكیاندا ببەستێت ئەم كارە بەناچاری دەكات. چیاو شاخەكان باشترین پارێزەری كورد بوون بەڵام كوردیشیان فێری كەمتەرخەمی كرد، تۆ بڵێیت پشت بەستنی بەردەوامی كورد بە چیاكان وای لێنەكردبێت پشت بەستن بەغەیری خۆی نەكاتە خوو؟ ئەو شۆڕشانەی كە تیایاندا كورد پشتی بەهێزێكی دەرەوە نەبەستبوو زۆر كەمن. بەڵام سەرەڕای ئەو پشت بەستنە، ئەو پەیمان بەستنانە زۆربەی كات چەوت بوون.

كورت بینیی پێشەواكان لەوەدا بوو كە پشتیان بە عوسمانییەكان دەبەست دژی ئێران و بەپێچەوانەوە. پشتیان بەرووسیای قەیسەری دەبەست دژی عوسمانیەكان و بەپێچەوانەوە، راستە لەمەزیاتریان بۆ نەدەكرا بەڵام نازانین چاوەڕێی چییان دەكرد؟ چاوەڕێی ئەوەیان دەكرد هاوپەیمانەكە رێگە بە دروست بوونی ئەمارەتێكی سەربەخۆ بدات؟

نموونەیەكی زەق لەسەر كورتبینیی و لەسەر بەستنی چارەنووسی ئەمارەتەكە بەچارەنووسی یەكێك لەلایەنە ناكۆكەكان كاری میرێكی بابان بوو كاتێك دوو كوڕی سوڵتان سولەیمانی قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦) دژی یەكتر وەستان، میری بابان لایەنی یەكێكیانی گرت بەڵام نرخی لێبوردنی سوڵتان لەو كوڕە ئەوەبوو كە سەری ئەو میرەی بۆ بنێرێت چونكە ئەمیان ئاگری نێوان دووبراكەی خۆش كردبوو، كوڕەكەی سوڵتان ئەمەی بۆ باوكی بەجێ هێنا و میرەكەی بابان سەری خۆی دۆڕاند[٢٣].

ئەمە تەنها یەكێكە لەسەدان نموونە لەسەر گرێدانی چارەنووسی ئەمارەت بەچارەنووسی هێزێكی مەیدانەكە، ئەنجامی زۆربەی ناكۆكییەكانیش ئاشت بوونەوە یان هاوسەنگی هێزەكان بوو. پاشان نۆرەی میرە كوردەكە دێت كە لایەنەكەی‌تر نارەحەتی بكات و حسابی كارەكەی لەگەڵدا بكات.

## ٢- دواكەوتنی دەزگاكان

دوو شتی گرنگ بۆ دامەزرندن و دەوام دان بە دەوڵەت پێویستە؛ (پێشەوا)و (دەزگا)، دەزگاكەش دەوام بەدەوڵەت لەپاش نەمانی پێشەوا دەدات. ئەگەر لەكوردستانیشدا قەیرانی پێشەوایەتی هەبووبێت ئەوا دەزگاكانی لەوپەڕی دواكەوتوویی‌دا بوون.

نموونەیەك لەسەر دواكەوتوویی دەزگای سەربازییە. پێویستە لێهاتوویی و ئازایەتی لەچوارچێوەی دەزگایەكدا بن بۆ ئەوەی دەوام بەم لێهاتوویی و ئازایەتییە بدرێت.لەباسێكی پێشووی (رابەر)یشدا نموونەی سوپای ئەڵمانیمان هێنایەوە كە چۆن

دەزگایەکی لێهاتوو –کە (دەستەی ئەرکانی گشتی– هیئة الارکان العامة) بوو– بووە هۆی دامەزراندنی ئەو سوپایەی کە لەم مەیدانەدا پلەی ژمارە یەکی هێناو هەر وا مایەوە[٢٤]، نموونەی دەزگای سیاسیش (ئەنجومەنی پیران)ی رۆما کە لێهاتوویی سیاسیی (هەروەها سەربازی)ی تێدا کۆببووەوەو ئەم ئەنجومەنەتوانی کۆنترۆڵی دەوڵەتێك بکات کە بەردەوام لە جەنگدا بوو لەگەڵ جیهانی دەوروبەری و بەردەوام لەفراوانبووندا بوو. ئەم ئەنجوومەنەش وەکو دەزگایەك بەرهەمی دەزگایەکی لەخۆی فراوانترە کە دەزگای عەشایەرییە.

زۆر کەس رەخنە لەعەشایەرییەت دەگرن و بەهۆیەکی نەبوونی دەوڵەتی دەزانن لەکاتێکدا راستییەکە ئەوەیە کە ئەگەر ئەو عەشایەرییەتە ببووایە بە دەزگایەکی بەهێز ئیمکانی ئەوە دەبوو کە دەوڵەتەکە دروست ببێت (بچووك بێت یان گەورە). راستە رەخنەگران لەعەشایەریەت –خۆشم یەکێکیانم– عەقڵ و نەفسییەتیان قبووڵی عەشایەرییەت ناکات بەڵام بیرکردنەوەیەکی وا لەراستییەکان بێئاگامان دەکەن.

لەرۆما و یۆنانی کۆندا خێڵەکان بناغەی (یان هیچ بناغەیەکی) نیزامی سیاسی و سەرجەم دەوڵەت بوون[٢٥]. خێڵەکان سەرۆکیان هەبوو (پادشای خێڵ) کە خۆیان بەهاوشانی پادشا دەزانی بۆیە توانیان یان حوکمی پادشایی نەهێڵن یان دەسەڵاتی پادشا کەم بکەنەوە. هەروەها وەك وتمان دەزگای خێڵایەتی بناغەی ئەنجومەنی پیرانی رۆما بوو، هەروەها ئەو دەزگایە بناغەی ئەنجوومەنی هاووڵاتیان Ecclesia لەیۆناندا کە ئەمیان دەسەڵاتی یاسادانانەو دەزگای خێڵایەتی هەروەها ئەساسی دەسەڵاتی بەجێهێنان بوو، لە(شار–دەوڵەت)ی (ئەثینا)دا دە خێڵ هەبوون، کە هەریەکێکیان پەنجا ئەندامی دەنارد. واتە بەکورتی عەشایەرییەت نەك هەر ئەساسی دەوڵەت بوو بەڵکو هەروەها نیزامێکی حوکمی دیاریکراویشی بەدەوڵەتەکە بەخشی.



لە سەردەمی تیرو کەواندا بۆشاییەکەی نێوان خەڵکی کوردستان و دەوڵەتانی دەورو بەری گەورە بوو.. ئەمڕۆ بۆشاییەکە گەورەتر بووە

ئەمڕۆ لەکوردستاندا حزبەکان دەوری دەزگایەك دەبینن (لەناو ژمارەیەك دەزگای‌تر) بەڵام ئەو راستیەی کە پێویستە خۆمانی لێ‌نەدزینەوە ئەوەیە کە فرەحزبی وەك دەزگایەك کەمتر شیاوی پێکهێنانی دەوڵەتە. فرەحزبی ئیمکانیاتی دروست بوونی دەوڵەت لەناو دەبات.

ئەمارەتە کوردییەکانیش نەیانتوانیوە وەکو سویسرا بکەن و دەزگایەکی سیاسی دابمەزرێنن بۆ یەکێتییەکی فیدراڵی یان بەلای کەمەوە کۆنفیدراڵی، یەکێتی سویسری سەرەتا بەسێ‌ناوچە دەستی پێکرد و بەردەوام لەزیادبووندا بوو ئەمەریکاش بەهەمان شێوە لە (١٣) ویلایەتەوە دەستی پێکرد. ئەگەر میرەکوردەکان ئەنجوومەنێکیان دروست بکردایە کە تیایدا هەر ئەمارەتێك ژمارەیەك نوێنەری هەبێت ئەوکاتە دەتوانرا ئەم یەکێتییە سستە بکرایە نەواتێك بۆ یەکێتییەکی بەهێزتر. بەڵام وەك چۆن هیچ ئەمارەتێك ئەو بەهێزە نەبوو کە بتوانێت هەموو ئەمارەتەکانی تر قووت بدات بێ‌ئەوەی تووشی سك چوون یان رشانەوە بێت، بەهەمان شێوە هیچیان بەچارەسەرێکی وەها رازی نەدەبوون چونکە ئەنجومەنی وا جگە لەوەی دەزگایەکی نوێ و نەناسراو بوو هەروەها کێشەی ئەوەش دەهاتە پێشەوە کە بارەگای ئەو یەکێتییە لەکام ئەمارەتدا بێت و لەمەوە قسەی (من چیم و ئەو چییە؟) سەری هەڵدەدا.

واشی بۆ دەچم کە زامواییەکان توانیبێتیان یەکێتییەکی وا دابمەزرێنن چونکە پاشای ئاشور لەهەردوو ساڵی ٨٨١و٨٨٠ی پێش زاین ناوی شاری ئارراکدی Arrakdi دەهێنێت بێ‌ئەوەی ناوی خاوەنەکەی بڵێت و لەساڵی ٨٨٠ دەڵێت کە پاش گرتنی ئەو شارە هەموو میرەکانی زاموا چۆکیان دادا[٢٧]، ئەمە لەکاتێکدا هەر میرێك و ناوی پایەتەختەکەی دەهێنێت. کەواتە بۆمان

هەیە بڵێین ئەو شارە مەرکەزی کۆنفیدراڵی زاموا بوو (بەڵام باس لەئەنجومەن نەکراوە) و بەبڕوای خۆمان ئەمە کارتێکردنی میدییەکان بوو (کەلەو کاتەدا کاریان لەسەر ناوچەکە دیاربوو) کە پێدەچێت لایەنی عەشایەری بەسەریاندا زاڵ بووبێت و یەکێتییەکی عەشایەرەکانیان پێکهێنابوو، ئەوەی وتیشمان هەمووی بۆچوونی خۆمانن و مەرج نیە راست بن.

## ٣- کێشەی کۆچەری

کۆچەری دەورێکی گەورەی بینیوە لەدواکەوتن و دروست نەبوونی دەوڵەتەکە.

کۆچەری گۆڕینی شوێنە، پێشکەوتنیش بەجێگیر بوونەوە بەندە. کۆچەر چونکە جێی خۆی دەگۆڕێت بایەخ بە شارستانی نادات. رووە ماددییەکەی شارستانییەتی کۆچەران بریتییە لە خێوەت و دەوار ، رووە رۆشنبیرییەکەی شارستانییەکەی کۆچەرانیش لەدەوار پێشکەوتووتر نییە.

کۆچەرانیش بایەخ بەکشتوکاڵ (سەرەتای شارستانی) نادەن. سومەرییەکان باسی هێرشەکانی خێڵە (ئامورییەکان) لەبیابانەکانی رۆژئاوای عیراق دەکەن کە کۆچەر بوون و گەنمیان دەست دەکەوێت بەتاڵانیو دەیخۆن بەڵام بێئەوەی بزانن چییە[٢٨]، بەڵام ئەم ئامورییانە دوایی کە جێگیر بوون بوونە میراتگری شارستانیەتی عیراقیەکانی پێش خۆیان.

کۆچەرەکان غەیری گۆشتی ئاژەڵ و شیر و هاوەڵاکانی و غەیری راخەر و پێخەفی زبر و سادەی خوری هیچت پێشکەش ناکەن، بەڵام هەموو کەسێك دەتوانێت ئەمانەت پێببەخشێت. لادێ نشین ئەم کارە دەکات بەپاڵ کشتوکاڵەوە. کۆچەران غەیری ئەمانە هیچت پێشکەش ناکەن لە وێرانی زیاتر.

هەبوونی کۆچەری واتای ئەوەیە بەشێکی کۆمەڵگە لەدەرەوەی شارستانیەت بمێنێتەوە، ئەو بەشەی کۆمەڵگەیەش دوو وێرانکاری بەئەنجام دەهێنێت؛ یەکەمیان ئەوەیە هیچ بینا ناکات، دووەمیشیان ئەوەیە بیناکەت بۆ دەروخێنێت. لەکوردستانی ئەوسادا گاڵتەکردنی کۆچەر بە لادێنشین و زیان گەیاندنیان بەو لادێ نشینانە شتێکی زانراوە.

## ٤- دواکەوتنی سەربازی

کورد میللەتێکی جەنگاوەرە، ئازایە بەڵام ئەم ئازایەتییە زیاتر ئازادییەکی فەردییە. باسی دواکەوتویی دەزگای سەربازیمان کرد، ئەم دواکەوتووییە تا ئەمڕۆ دەبینرێت کە بەدوو حکومەتی کوردییەوە تەنها لەشکری میلیشیا هەیە کە بەرامبەر لەشکرێکی نیزامی هیچی پێناکرێت.

دواکەوتوویی سەربازی لەهەندێك مەسەلەی ورد و تایبەتیشدا هەیە، با تەنها نموونەیەك لەنیشانەکانی عەقڵیەتی دواکەوتووی سەربازی بهێننەوە ئەویش پشت بەستن بەقەڵا[٢٩].

قەڵا یارمەتیت دەدا هێزێکی گەورەی دوژمن لەکار بخەیت، ئەگەر قەڵاکانیشت زۆربن ژمارەیەکی زۆرتری لەشکری دوژمن لەکار دەخرێت. ئەم بنەمایە زۆر سادەیە و بەڕواڵەت زۆر راستە بەڵام لەحەقیقەتدا بنەمایەکی پڕمەترسییە.

لەشەڕەکانی زاموا، میرەکانی زاماوا وەك باسمان کرد پاشەکشێیان کرد بۆ شار و قەڵاکانی خۆیان ئەمەش گەورەترین هەڵەیە چونکە ئەمەیە کە هەموو لەشکرێك مەبەستێتی؛ بتوانێت هێزی دوژمن بکاتە چەند پارچەیەك و ئەم پارچانە بەتەعبیری عەسکەری (پاروو لەدوای پاروو بخوات) بۆیە پادشای ئاشور شار و قەڵاکانی دەگرت؛ قەڵا لەدوای قەڵا و شار لەدوای شار.

باشتر دەبوو بۆ زاموابییەکان هەموو لەشکرەکەیان کۆبکەنەوە نەك بەو شێوەیە پەرش و بڵاوی بکەن، ئەم دەردە زۆر کۆنەو تائەمڕۆ ماوە.

مەترسی پەنا بردن بۆ قەڵا بۆ (صلاح الدین) ئاشکرا بوو، پاش صوڵح کردن لەگەڵ خاچپەرستان هێشتا چەند شوێنێکی کەم لەژێر دەستی دوژمندابوو، صلاح الدین لەوە دەترسا خاچپەرستان جارێکیتر هێرش بەرنەوەو موسڵمانان نەجووڵێن و هەر یەکێکیان لەناو قەڵای خۆیدا بمێنێتەوە و ئەمەش تیاچوونی موسڵمانانی تیا بێت[٣٠].

خەڵکی شاری (سپارتا) لەیۆنانی کۆندا شوورەیان بۆ شارەکە دروست نەکردبوو.

خەڵکەکە دەیانوت باشترین شوورە سنگی لاوەکانمانە بۆیە سوپای (سپارتا) بووە نموونەیەکی کەم وێنەی جیهان.

کوردیش بەپشت بەستن بەکێوەکانەوە نەوەستا بەڵکو (وەکو هەموو وڵاتێکیتر) شورەشی بۆ شارەکانی خۆی دروست دەکرد.

ئەو رۆژەش کە دەبیستن  لەشکرێکی کوردی لەچەند شەڕێکی کراوەدا (شەڕی  بەرە) دژی دەوڵەتێك بەرپا بکات و تیایاندا سەربکەوێت ئەوکاتە دەتوانین بڵێین کە وەرچەرخانێك لەمێژووی کوردستاندا رووی‌دا بەڵام با جارێ چاوەڕێی ئەمە نەکەین چونکە کورد لەرووی تەکنەلۆجیای سەربازییەوە زۆر لەدواوەیە.

## ٥- مەرکەزەکانی قورسایی شارستانی

کوردستان مەرکەزێکی شارستانی نەبووە، لەمەش خراپتر ئەوەیە  کوردستان کەوتۆتە نێوان مەرکەزەکانی قورسایی شارستانی، کاری ئەم مەرکەزانە ((پلیشاندنی)) کوردستان بوو نەك ئەوەیە کوردستان سوودیان لێوەربگرێت.

کوردستان تا ماوەیەکی زۆر لەسەر قەراغی شارستانیی  عێراقیدا بوو، گەلانی کۆنی کوردستان تەنها لاساییان دەکردەوە، تەنها یەك یان دوو گەل هەبوون کە بەزمانی خۆیان شت بنووسن بەڵام ئەمەش بەرادەی پێویست نەبوو.

لەگەڵ ئەو لاسایی کردنەوەیەش هێشتا ئەو گەلانە زۆر  دواکەوتوو بوون لەچاو گەلانی عێراق، عێراق مەرکەزێکی گەورەی شارستانی بوو کە دەبوایە ئەو گەلانە سوودیان لێوەربگرتایە.

لەسەدەی شەشەمی پێش زاینیش بەدواوە مەرکەزێکی گەورە لەرۆژهەڵاتی کوردستاندا پەیدا بوو ئەویش ئێران. لەو کاتەوە کوردستان کەوتە نێوان دوو مەرکەزی شارستانیی رۆژئاوا- رۆژهەڵات بی‌ئەوەی سوود لەهیچیان وەربگرێت.

لەو ماوەیەشدا کە یۆنانییەکان ئەو ناوچەیان تا نزیك هندستان گرت و یەك مەرکەز پەیدا بوو خەڵکی کوردستان نەیاندەتوانی ببنە بەشێکی کاریگەر لەشارستانی (هیلینستی)و یەکێك لەهۆکان ئەوەیە  یۆنانییەکان خۆیان بە باڵاتر دەزانی لەکاتێکدا دەبێت چاوەڕێی ئەوە بکەین کە گرنگترین هۆ دواکەوتوویی خەڵکی کوردستان بووبێت.

حاڵەتێکی‌تری یەك مەرکەز سەردەمی ئیسلامییە کە دەزگاکانی زانست و شارستانی لەبەردەم گەلانی غەیری عەرەب کرانەوەو هەزاران زانای غەیری عەرەب ناویان دەرکرد کە بەشێکیان کورد بوون بەڵام دیسان لەم  حاڵەتەشدا نە زانا کوردەکان هاوشانی زانایانی گەلانی‌تری موسڵمان بوون و نە کوردستان شاری ناوداری زانستیی هاوشێوەی (بوخارا)و (نیسابور) و (بەغدا) ....ی هەبوو. پاش ماوەیەکی زۆریش دوو مەرکەزی عوسمانی-ئێرانی پەیدا بوون و مەسەلەکە وەکو خۆی مایەوە.

**بەکورتی:**

١- کورد یان کەوتبووە کەناری شارستانییە گەورەکان.

٢- یان کەوتبووە نێوان دوو مەرکەزی گەورەی شارستانی.

کوردیش نەیتوانیوە سوود لە هیچیان وەربگرێت.

کوردی ئەمرۆش لەنێوان  سێ مەرکەزی‌شارستانیی ناوچەیی (ئێران- تورکیا- مەرکەزی عەرەبی)یە، هەروەها نێوان دوو مەرکەزی گەورەی رۆژهەڵات- رۆژئاوایە. هەرچەندە کورد لەناو  مەرکەزی شارستانی (رۆژهەڵات)دایە بەڵام ئەوەندە بەرکەنار کەوتووە وادەزانیت لەناو ئەویشدا نییە. لەناو ئەو قەرەباڵغییەشدا کورد لەپەراوێزەکاندایە.

## ٦- سوود وەرنەگرتن لە تایبەتییەکانی کورد

بڕوا ناکەین لێکۆڵینەوەیەکی جیددی و  زانستی لەبارەی تایبەتییەکانی کوردەوەبەئەنجام هێنرابێت. ئەمەش روویەکی تر دواکەوتنە، دواکەوتنە لە لێکۆڵینەوەو تێگەیشتن لەو میللەتەی  کار لەناویدا دەکەین.

باسی ئازایەتیی فەردیی کوردمان کرد کە پێویستە بەپاڵ ئەم  ئازایەتیە لێهاتوویی سەربازی هەبێت، بۆنموونە (ضبط) زۆر پێویستە، بەبڕوای خۆشمان کورد پلەی یەکەمی (ضبط)ی سەربازی بۆ دروست دەبێت ئەگەر بایەخ بەمە بدرێت، هەمان شتیش بۆ تایبەتییەکانی‌تر.

(کێرزن‌Curzon)ی ئیستعماری بەریتانی (١٨٥٩-١٩٢٥) دەیوت کەوا دەتوانرێت وا لەکورد بکرێت حەز بە نیزام بکەن (هەرچەندە بەزۆر نەزان و زۆر گەمژە ناویان دەبات)[٣١]، بەڵام هیچ پێشەوایەك هەوڵی  بەکارهێنانی ئەو ئیمکانییەتەی نەداوە، بەپێچەوانەشەوە خۆیان یەکەم کەسن نیزام پێشێل دەکەن.

تایبەتییەکی‌تری کورد ئەو دڵسۆزییەی  بۆ پێشەوا هەیەتی، (صدام) باش لەو تایبەتییەی کورد تێگەیشتبوو کاتێك وتبووی (خۆشم گویم لەو قسەیەی بوو پێش راپەڕین) کەوا کورد گۆشەیەکی مردووی بینینی هەیە واتە  تەنها ئەو پێشەوایە دەبینێت کە شوێنی کەوتووە و دڵسۆزییەکی تەواوی ئاڕاستە دەکات.

ئەم تێگەیشتنە پێچەوانە قسەی باو لەبارەی (خیانەت لەناو کورددا)یە. خیانەت بەزۆری لەلایەن سەرکردەکانەوە دەکرا ئەویش ئەنجامێکی سروشتییە بۆ چەند هۆیەك:

١- بێ‌هێز مەیلی هەیە بۆ تەسلیم بوون بۆ بەهێز.

٢- دەسەڵات گەندەڵییەو ڕوویەکی ئەو گەندەڵییەش ئەوەیە کە سەرکردە حەز لەدەسەڵات دەکات هەتا ئەگەر لەڕێگەی خیانەتیشەوە بێت.

٣- سەرکردەکان هاوشانی یەکتر بوون و سەرکردەیەك نەبووە  هاوشانی نەبێت بەجۆرێك کە یاخی بوون لێی موغامەرە بێت.

(چالاکی) تایبەتیەکی تری کوردە بێ‌گومان هەندێك ناوچە هەن  خەڵکەکەیان (گێژن) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەمەڵ نین.

مەبەستی ئەم باسەمان ئەوە نییە  هەموو تایبەتییەکان دەست نیشان بکەین و تەنها لێرەدا دوو خاڵی گرنگ دەڵێین:

١- کورد بەهۆی گۆشەگیرییەوە تایبەتییەکانی وەچە بەوەچە دەگوێزرایەوە ئەویش وەکو جوولەکە بەڵام جوولەکە کام تایبەتی ناشرین و نامرۆڤانەیە بۆیان ماوەتەوە.

٢- بەکار هێنانی تایبەتییەکان گوناهێکەو نەزانینیان گوناهێکی گەورەترە.

## زریانی دەرەوە

تا ئێستا باسمان لەهۆکارە ناوەکییەکان  کردووەو گرنگێتیی کەمترمان بەهۆی دەرەوە دابوو.  بەڵام هۆی دەرەوە لەژمارەیەك حاڵەتدا ڕێگەدەگرێت لەدروست بوون و بەهێزبوونی ناوەوەو گرنگترین حاڵەت (لێدانە تێکشکێنەرەکان)ە کە لێرەدا ناوی (زریان)مان لێ ناون.

پەندێکی عەرەبی هەیە  دەڵێت: ئەو لێدانەی پشتت نەشکێنێت بەهێزت دەکات، کوردستان لێدانی پشت شکێنی زۆری دیوە.

نموونەی زریانی دەرەوە هێرشەکانی ئاشوورییەکانە، لەسەدەی سیانزەمی پێش زاینەوە تا سەدەی یانزەی پێش زاین کوردستان لێدانی وای ئاشوری بەخۆیەوە بینی، بەڵام لێدانی سەخت لەسەردەمی نوێی ئاشورییەوە دەستی پێکرد. ئەویش لە سەدەی نۆیەمی پێش زاین و تاماوەیەکی کەم بەر لەهەرەسی دەوڵەتی ئاشوری. کوشتنی دانیشتوان و سووتاندنی شار و گوندەکان و ئازاردانی دیلەکان تا مردن کارێکی بەردەوامی پادشاکانی ئاشور بوو وشانازییان پێوە دەکرد:

(سەرەکانیان (=سەری کوژراوەکانیان)م بەقەدی درەختەکاندا بەست، کوڕ و کچەکانیانم بەئاگر سووتاند)[٣٢]..(شارەکانی.. (ناوی چەند  شارێك دەهێنێت) لەگەڵ ١٥٠ شار (یاخود گوند)ی دەوروبەریانم ڕووخاند و وێران کرد و سوتاند، کردمن بەتەپۆلکە و وێرانە)[٣٣]..ئاشور ناصیرپالی دووەم (٨٨٣-٨٥٩پ.ز)

(هەشتا شاری قایمم ...گرت، لەگەل (شارە) بچووك و بێ‌ژمارەکان تا ڕێك نزیك ئیزیرتو، وێرانم  کردن، تێکم دان و بەئاگر سوتاندمن)[٣٤]-ئاشور بانیپال (٦٦٨-٦٢٦پ.ز)

بەم لێدانانەش ئاشورییەکان ئیمکانیەتی سەرهەڵدانی دەوڵەتیان لە کوردستاندا بڕی. لە میانەی شەڕی پارثییەکان و ڕۆما و پاشان ساسانیەکان و ڕۆما کوردستان تووشی وێرانکاری زۆر بوو.

وێرانکاری‌ییەکان ئەوەندە زۆرن کە لێرەدا ناکرێت باسیان بکەین،  دوایەمین زریانی ڕۆژهەڵات- ڕۆژئاوا هێرشی (هرەقل)ی بێزەنتی بۆ شارەزوور بوو کە لەمیانەی جەنگەکەی دژی ئێران چی لەبەردەمدا بوو وێرانی کرد[٣٥].

ئەوەندەی پێ‌نەچوو دوای ئەوە لەشکری ئیسلامی هات و چەند شەڕێك لەکوردستاندا ڕوویان دا بەڵام شارەکانی کوردستان تووشی سوتاندن و وێران کردن نەبوون، ئەمەش تا ماوەیەکی زۆر مایەوە تا سەردەمی لاوازیی  دەوڵەتی عەبباسی کە ئەمیری زۆر لەهەرێمەکاندا پەیدا بوون و  شەڕی نێوان ئەو ئەمیرانە کاولکاریی لەگەڵ خۆیدا هێنا بەڵام هێشتا حاڵ نەگەشتە حاڵی زەمانی زوو.

لەو سەردەمانەداو ئەوەی  ناوی زریانی بۆ دەشێت هێرشەکەی (جلال الدین)ی خوارزمی‌یە (ساڵی ١٢٢٥ز بەدواوە) کە لەرۆژهەڵاتەوە هات و وێرانکارییەکی کەم وێنەی ئەنجام دا، پاش ئەویش بەچەند ساڵێکی کەم (تەتار) هاتن و  وێرانکارییێکیان بەئەنجام هێنا کە بوونەتە نموونەی مێژوویی، پاش نزیکی سەدەو نیوێکیش کوردستان زریانی تەیموور لەنگی بینی[٣٦].

پاش ئەمانە شەڕی ئێران– دەوڵەتی عوسمانی بەردەوام وێرانکارییان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا.

ساڵی ١٨٢٠ (ریچ) لەگەشتەکەیدا لە کوردێکی پرسی کە بۆچی شاری سلێمانی وەکو وێرانە دیارە، ئەویش وتی: کێ دەیەوێت شتێك چاك بکاتەوە ئەگەر لەوە دڵنیا نەبێت رۆژێك سوودی لێوەربگرێت و رەنگە پاش چەند رۆژێك تورکەکان یان فارسەکان وێرانی نەکەن[٣٧]. زریانیش بەم جۆرە دەوام بە دواکەوتوویی دەدەن و بیناکردنی وڵات (نەك هەر دەوڵەت) دەکەنە کارێکی بێسوود.

زریانەکان تا سەردەمی نوێش بەردەوام بوون، ئەوەندەش بەسە بۆ تیگەیشتن لە کاری زریان کە ئاوڕ بدەینەوە لە چالاکییەکانی حکومەتی عێراقی ساڵانی ١٩٨٧–١٩٨٨ لەراگواستن و وێران کردنی گوند و شارۆچکەکان و بەناوئەنفال و کیمیایی بەکارهێنان، ئەم کارانە پێشمەرگەیان ناچار دەکرد ناوچە ئازادکراوەکان چۆڵ بکەن و هەرەسێکیتری شۆڕشیان رابگەیەنن.

## پیلانی هەمەلایەنە

کاری پیلانەکانی دەوڵەتانی دەوروبەر لەسەر دروست بوونی دەوڵەت شتێکی زیاد دەبێت ئەگەر لێرەدا لەسەری بڕۆین ئەمە شتێکە هەموو کەس دەیزانێت.




لێرەدا تەنها ئەوە دەڵێین کەوا پیلانەکە (هەمەلایەن) بوو، واتە پیلانەکە هی یەك دەوڵەت و دوان نەبوو بەڵکو هی هەموو دەوڵەتێکە، تەنانەت دەوڵەتە دوورەکانیش دەستیان لەمەدا هەبوو. جگە لە دەوڵەتە ئیقلیمیەکان؛ بەریتانیا، رووسیای قەیسەری، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئەمەریکا، نەمسا، کەم تازۆر دەوریان هەبوو.

بەریتانیا دژی بزووتنەوە کوردییەکان دەوەستا چونکە مەبەستی بوو دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر رووسیای قەیسەری (دوژمنی بەریتانیا) تێك نەشکێت، بۆنموونە کۆمەکی بەریتانیا بۆ دەوڵەتی عوسمانی دژی راپەڕینی ١٨٤٧ی (یەزدان شێر)[٣٨]. ئەڵمانیا هاوپەیمانێکی دەوڵەتی عوسمانی بوو، ئەفسەر و سەربازی نەمسایی لەئێراندا لەدژی شۆڕشێکی کوردی لە سەدەی نۆزدەدا شەڕیان دەکرد، کۆمەڵەکانی بەگاورکردن و بەتایبەتی کۆمەڵە ئەمەریکییەکان کۆمەکی عوسمانییەکانیان دابوو بۆ لێدانی بەدرخان[٣٩]... تاد.، ئەمڕۆش هەر سێ دەوڵەتی تورکیا- ئێران ــ عێراق لەهەموو شتێکدا ناکۆك و دژ بەیەك بن لەسەر مەسەلەی کورد رێکن.

## میراتیی رابوردوو

پاش دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی کورد هیچی دەست نەکەوت جگە لە کوردستانێکی بچووککراوی خاوەن ئۆتۆنۆمی کە بە تەنیشت ئەرمینیایەکی گەورەکراوی سەربەخۆ خرایە سەر نەخشەی سیاسی.ئەم کوردستانە بچووککراوەش((مەرج و ئەگەر))ێکی زۆری خرایە بەردەم تا ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ[٤٠]. ئەمەیە پەیمانی سیڤەر کە ــ وەکو دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت ــ هەندێك کورد بەنەزانینییەوە ناوەکەیان بەمنداڵی خۆیان بەخشیوە[٤١].

بەهەرحاڵ (لۆزان) سیڤەری هەڵوەشاندەوە.. بەر لەم دوانەش میراتی رابردووی کوردستان گەورەترین بەهانە بوو تا رێگە بە قەوارەی کوردی نەدرێت، پڕوپاگەندەی رۆژئاوا کوردی وەك موسڵمانێکی دەمارگیر و بەرپرسێکی گەورە لە قەسابخانەکانی ئەرمەنە هاودینەکەیان پیشان دا بێئەوەی باس لە هەرەشەی قەومییە ئەرمەنەکان لەکوردستان بکرێت[٤٢] و بێئەوەی لێکۆڵینەوە بکرێت کە ئایا ئەم قەسابخانانە راستن یان ئەفسانەن وەکو ئەفسانەی لەناوبردنی شەش ملیۆن جوولەکە.

لەلایەکی ترەوە پەرتەوازەیی و دواکەوتوویی کورد هۆیەکی گەورە بوو بۆ ئەوەی هیچ حسابێکیان بۆنەکرێت، نەهێزێکی یەکگرتووی کوردی هەبوو، نەدەزگای بەهێز و پتەو، نەپێشکەوتنێکی زانستی و تەکنەلۆجی و نە چینێکی گەورەی رۆشنبیران، نە دەوڵەتێکی پێشتری کوردی.

وڵاتان داگیر دەکرێن بەڵام دوایی قەوارەیەکی سیاسییان بۆ دروست دەبێت چونکە رابردوویان هەیە، رابردووی ئەوان دەوڵەتێکی کۆنترە، یاخود ئێستایان هەیە، ئێستاکەشیان شتێکە کە شەرمی لێنەکرێت.

## کێشەی نوێ

ئەوەی لەچەرخی تیروکەواندا نەکرا لەچەرخی چەکی ئەتۆمیدا زەحمەت ترە. رۆژ لە دوای رۆژ بۆشاییەکە گەورەتر دەبێت. بۆشایی لە هێزی سەربازی نێوان کورد و دەوروبەری، بۆشایی لەعەقڵیەت، عەقڵیەتی ئیمپراتۆری لای دەوروبەر و عەقڵیەتی گوند و شارۆچکە لای پێشەواکانی کورد.

داهێنان لەجیهاندا و کاوێژکردنی داهێنانی کۆنتر لای ئێمە، داگیرکردنی رۆشنبیری رۆژئاوایی، هەموو شتێکی رۆژئاوایی باشەو ئێمە خراپین. خۆمان بەکەم دەزانین بۆیە بەبچووکی دەمێنینەوە. هەموو ژیرێك دەزانێت رەوشت چەند بۆ میللەت پێویستە، ئارەزوو پەرستانی خۆشمان نەخشە جیهانییەکەی تێکدانی رەوشت جێبەجێ دەکەن.

زانست و تەکنەلۆجیامان پێویستە بۆ پێشکەوتن، بەڵام لای ئێمە پێشکەوتنخوازییەکی لنگەوقووچ هەیە کە خۆی لە چەند شتێکدا دەبینێتەوە وەك بەرەڵایی و تێکەڵاوی پیاو و ئافرەت و هەڵپەرکێ و شایی خێزانی و کردنەوەی کافیتێریای خێزانی کە تیایدا ئافرەت وەکو جاریە خزمەتی سمێڵ زلەکان دەکات.

کەم بوونی ژمارەی دانیشتوان هەرەشە نەك تەنها لە سەر ئیمکانەتی هەبوونی قەوارەی سیاسی بەڵکو هەروەها لەسەر وجودی میللەت دەکات. کەم بوونی دانیشتوان زەنگی خەتەری توانەوەی میللەتە. لێپرسراوانیش لەجیاتی باش کردنی گوزەرانی خەڵك تا زاوزێ زیاتر بێت وڵات دەکەنە دۆزەخ و خەڵك ناچاری هەندەران دەکەن تا دوایی لەناو دەریای رۆژئاوادا پاش چەند نەوەیەك بتوێنەوە.

ئەمانە تەنها چەند نموونەیەکی کەمن لەسەر کێشەی نوێ کە چوونەتە پاڵ ئەو کێشە کۆنانەی چارەسەر نەکراون.

ئەگەر کورد وا بەرەو لاوازی ببرێت هەرگیز قەوارەی خۆی نابینێت مەگەر بارودۆخی ئیقلیمی و جیهانی بگۆڕێت. ئەوانەش کە ئومێدیان بەئەمەریکا هەیە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کورد تەنها خەون دەبینن چونکە هەموو دەزانین کە ئەمەریکا نایەوێت تورکیا لەخۆی برەنجێنێت.. راستییەکی تریش هەیە بیری لێنەکراوەتەوە؛ ئەمەریکا دەیەوێت رژێمی عێراق بگۆڕێت، بەڵام کە رژێم گۆڕا پێویستە رژێمێك بێتە جێگەی کە بەدڵی ئەمەریکا بێت، ئەوکاتەش پێویستە ئەمەریکا دوو دەوڵەت رازی بکات؛ تورکیا و عێراق، پاشان ئەمەریکا دەیەوێت رژێمێکی لایەنگر لەئێران هەبێت، ئینجا دەبێت ئەمەریکا سێدەوڵەت رازی بکات؛ ئێران و تورکیا و عێراق، هەمان شتیش بۆ سووریا، ئەمە چوار دەوڵەت، هەروەها دەوڵەتە عەرەبییەکانیتر؛ ئەمە بیست و ئەوەندە دەوڵەت.

بەکورتی؛ کلکایەتی بۆ ئەمەریکا یەکسانە بەگۆڕینی هەموو ناوچەکە بە موستەعمەرەیەکی ئەمەریکی و ئەوکاتە ئەمەریکا زیاتر لەجاران دژ بە دەوڵەتی کوردی دەوەستێت.

بەر لەوەش پەرت کردنی عێراق رێگەی دروست کردنی دەوڵەتی کوردی نییە چونکە جگە لەوەی کە تورکیا بەم دەوڵەتە رازی نییە، هەروەها دەوڵەتی شیعە لەباشووری عێراق دەچێتە پاڵ ئێران، ئەگەر تەنها کوردستانیش جیابێتەوە شیعە دەبێتە زۆرینە لەعێراقی ئایندەو لەجیاتی باشوور ناوەڕاستی عێراقیش هەروا حوکم دەکات.

کەواتە پەرت کردنی عێراق دوایەمین شتە ئەمەریکا بیری لێبکاتەوە.

## چی بکرێت؟

لەکۆتاییدا و پاش بێئومێد کردنی خوێنەر دەڵێین: تەنها مرۆڤی رووخاو بێئومێد دەبێت، دیارە نابێت مرۆڤ رووخاو بێت.

رێگەی سەرەکیی هەر میللەتێك بۆ دامەزراندنی دەوڵەت چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانەو بەهێزکردنی (ناوەوە)یە. کاتێکیش بەهێزبوویت هیچ مەکە غەیری خۆ بەهێز کردن، بەردەوام و بەردەوام خۆت بەهێز بکە تا دەرفەتێك دێت، ژیانیش پڕە لەدەرفەتی گونجاو.

لێرەداو پاش باسکردنی هۆکارە سەرەکییەکان نەبوونی دەوڵەت شتێکی زیاد دەبێت ئەگەر نەخشەی کار بخەینە روو، بەڵام نەوەکو بوترێت کە نەخشەی وامان نییە ناچارین نەخشەکە بڵێین ئەگەر بەشێوەیەکی کورت و گشتیش بێت:-

١- ئایدیۆلۆجیا: ئایدیۆلۆجیایەکی زاڵ، جەماوەری، جەنگاوەر، جیهانی.

٢- دەزگا: کارگەی بەرهەمهێنانی سەرکردە و سەربازی عەسکەری و سیاسی بێت.

٣- پێشەوا: لەئاستی سەردەم، خاوەن کاریزما، بێهاوشان.

٤- شتی تر و بەپێی ئەهمیەتیان.

ئەمە رێگەی بەهێز بوونە، پیلانیش هەر دەگێردرێت و شەڕ هەر دەکرێت و قوربانی دەبێ بدرێت.

ئەمە نەخشەیەکە بۆ هەموو کەسێك، دیارە نەخشەی ئیسلامیش سیمای تایبەتی خۆی هەیە لەجۆری ئایدیۆلۆجیا و دەزگا و پێشەوا ، ئەمەشیان بابەتێکیتایبەتی پێویستە.

## پەراوێزو سەرچاوە

١- لەبارەی ئەم دەوڵەتە بڕوانە باسێکی خۆمان بەناونیشانی: خامـازی... لەدەوڵـەتێکی گـەورەوە بـۆ گوندێکـی بچـووك، گۆڤاری رامان ژمارە٢٤/٥/٦/١٩٩٨ل١٧١-١٧٦

2- D.D.Luckenbill, Ancient Records of Babylonia and Assyria (ARAB),1,1926,S448

هەروەها کتێبەکەمان (مێژووی گەلی لوللو) ل٣٥.

٣- محمد امین زکی، تأریخ السلیمانیه و انحائها، ت. ملا جمیل الروژبیانی، بغداد، ١٩٥١،ل١٠٨و١١٤.

4- E.A.Speiser, Southern Kurdistan in the Annals of Ashurnasirpal and Today, Annuals of the American Schools of Oriental Research,8,1928,p.29.

سپایزەر بەراوردی تریش دەکات.

٥- الجنرال کارل فون کلاوزفیتز، الوجیز في الحرب، ت.اکرم دیری و الهیثم الأیوبي،١٩٧٤،ل٣٩بەدواوە.

٦- بۆنمونە بڕوانە قسە (دومۆرگان) کە هاتبووە ناوچەی ڕەواندوز لـەم بارەیـەوە و لـەگۆڤاری (رامـان) ژمـارە٣١، ١٩٩٩/١/٥ بابەتەکەیمان وەرگێڕاوە، بڕوانە هەروەها ڕەخنەمان لەقسەکەی.

٧- ماری گریگور، التأریخ الرومانی،ت.امین سلامە، القاهرە،١٩٥٩،ل١٣٢.

٨- دونالد ددلی، حضارة روما، ت.جمیل یواقیم الذهبي و فاروق فرید،١٩٦٤،ل٥٣.

٩- ول دیورانت، قصة الحضارة،ج١،ت.محمد بدران، ل٢٢٠.

بابەتێکی بڵاونەکراوەشمان هەیە لەبارەی رێگەوبانی رۆمایی.

١٠- الامیر شرف خان البدلیسي، الشرفنامة، ت.ملا جمیل بندي الروژبیانی، بغداد،١٩٥٣،ل٢٦.

١١- جمال نبز، الامیر الکردي، میر محمد الرواندوزی الملقب ب(میری کۆرە)، ت.فخری سلاحشور، اربیل، ١٩٩٤،ل٧٣.

12- A.K.Grayson, Assiran Royal Inscriptions(ARI), Vol.1,1972, S710.

13- ARAB,1,S236-237.

١٤- محمد امین زکی، تأریخ السلیمانیه،ل٩٦.

١٥- نیقولو مکیاڤللی، مطارحات مکیاڤللی،ت.خیری عماد،ط٢،١٩٧٩،ل٤٤١-٤٤٤.

١٦- جمال نبز، الأمیر الکردي،ل١٢١-١٢٣.

١٧- سەرچاوەی سەرەوە،ل٨٤.

١٨- سەرچاوەی سەرەوە،ل٩٠.

١٩- سەرچاوەی سەرەوە،ل١٤٢بەدواوە.

٢٠- بڕوانـە بـۆ ئەمـە: بـهاءالدین بـن شـداد،النـوادر السـطانیة والمحاسـن الیوسـفیة، تحقیـق الدکتـور جمـال الدیـن الشیال،١٩٦٤،ل٢٩-٣٠.

٢١- سەرچاوەی سەرەوە،ل٢٤٦.

22-ARI,2,1976,p.128.

هەروەها کتێبی (لوللو) ل٣٥.

٢٣- الشرفنامه،ل٢٩٤.

٢٤- بڕوانە (رابەر) ژمارە ٣٤.

٢٥- بڕوانە (رابەر) ژمارە ٣٦،ل٢٩.

٢٦- بڕوانە بۆ نموونە دکتور ابراهیم درویش، الدولة نظریتها و تنظیمها ،١٩٦٩،ل١٢٠.

27- ARAB,1,S455.

هەروەها کتێبی (لوللو) ل٤١-٤٢.

٢٨- بڕوانە، جورج رو، العراق القدیم،ت.حسین علوان حسین،بغداد،١٩٨٤،ل٢٣٩.

هەروەها، طه باقر، مقدمة في تأريخ الحضارات القدیمة، بەشی ٢،ط٢،ل٤٠٨.

٢٩- مەکیاڤللی باسی زیانە زۆرەکانی قەڵای کردووە، بڕوانە؛مطارحات مکیاڤیللی، ل٥٣٤ بەدواوە.

٣٠- بهاء الدین بن شداد، النوادر السلطانیة،ل٢٣٥.

٣١- الدکتور ن.أ.خالفین، الصراع علی کردستان،ت.الدکتور احمد عثمان ابوبکر،بغداد ١٩٦٩،ل١٥.

32- ARAB,1,S450.

33- ARAB,1,S455.

٣٤- بڕوانە باسێکی وەرگێڕاومان لە گۆڤاری (رامان) ژمارە٢٨،٥/١٠/١٩٩٨،ل١٥٠.

٣٥- بڕوانە: محمد امین زکی، خلاصة تأریخ الکرد وکردستان،ت.محمد علی عونی،١٩٣٦،ل١٢٠.

٣٦- سەرچاوەی سەرەوە،ل١٤٩ بەدواوە.

٣٧- جمال نبز، الامیر الکردی،ل٧٩.

٣٨- خالفین، الصراع علی کردستان،ل٨٠.

٣٩-سەرچاوەی سەرەوە، ل٦١.

٣٤- بڕوانە باسێکی وەرگێڕاومان لە گۆڤاری (رامان) ژمارە٢٨،٥/١٠/١٩٩٨،ل١٥٠.

٣٥- بڕوانە: محمد امین زکی، خلاصة تأریخ الکرد وکردستان،ت.محمد علی عونی،١٩٣٦،ل١٢٠.

٣٦- سەرچاوەی سەرەوە،ل١٤٩ بەدواوە.

٣٧- جمال نبز، الامیر الکردی،ل٧٩.

٣٨- خالفین، الصراع علی کردستان،ل٨٠.

٣٩-سەرچاوەی سەرەوە، ل٦١.

٤٠- بڕوانە محمد امین زکی، خلاصە تاریخ الکرد...، ل٢٦٦-٢٦٧.

هەروەها دکتور کمال مظهر، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الأولی، ت.محمد الملا عبدالکریم،ط٢،بغداد،١٩٨٤،ل٣٤٧.

٤١- دکتور کمال مظهر، سەرچاوەی سەرەوە،ل٣٤٤ پەراوێزی (١٠٠).

٤٢- بۆ هەڕەشەی قەومیە ئەرمەنەکان و هاندانی ئەرمەنەکان لەلایەن ئەو قەومیانەوە دژی کورد بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل٢٦٣ بەدواوە